ئەخ و تف: [ناو،ت] ئاخ و تف. (اخ تف)
ئەخیار: ئەغیار. (١) [ناو] بێگانە؛ غەیرگەل. (اغیار) (٢) هۆشیار (هوشیار)
ئەخیاوان: [ناو] شەقام. (خیابان)
ئەخیە: [ناو] فد: مێخ‌تەویلە؛ مێخ‌زنجیری تەویلە؛ کولْمێخی بەستنەوەی هەوساری ئەسپ و حەیوانی بەرزە. (میخ طویلە)
+ ئەدا: [لەچاوگەی دان] دەدا؛ کەسێک کە شتێک بە کەسێک ئەدا؛ نان دەدا، پارەدەدا، جوین دەدا. (می دهد)
ئەدا: (ناو) (ف. ما) (١) ناز وقە مزە (٢) دایک؛ داڵک (١. کرشمە ٢. مادر)
ئەدا دەرهێنان: [چاوگە،ت] دەمە لاسکێ‌- کردنەوە؛ لاسایی‌کردنەوە؛ خۆ لە جێی کەسێک نیشاندان؛ تەقلیت و گاڵتە کردن. (ادا درآوردن)
ئەدا و ئەتوار: [ناو،ت] عد؛ فد: (١) ئوێن دەرهێنان؛ کردەوەی شانۆ گەریانە بۆ شۆخی و پێکەنین. (٢) ڕەفتاری ناپەسەند و ناشیرین. (ادا و اطوار)
ئەداوەکردن: [چاوگە،ت] (١) دووپات- کردنەوەی قسە. (بازگویی سخن) (٢) دانەوە؛ قەرز دانەوە؛ قەرەبووکردنەوە. (ادا کردن)
+ ئەدەبیات: [ناو،ت] فد: (ئات) ڕەوتی (کۆ) ی ئارەویە، (١) نیشان دانی هونەری هەر میلەتێک لە ڕێژەکی کەلام و وێژەدا. (٢) کۆی نوسراوە گەلێ کە ناوەرۆکیان لە لایەن میلەتگەلی جۆراو جۆرەوە پەسەند کرابێ. (ادبیات)
ئەدەبیاتی کلاسیک: فد: ئەدەبیاتی کەونارا؛ هەروەها شێعری کلاسیک: شێعری کۆن؛ دارای وەزن و قافیە. (ادبیات کلاسیک)
ئەدێ: منداڵان دەڵێن؛ دایکە؛ دایە. (مادر)
ئەدی ئەدی: بەڵێ بەڵێ. (بله بله)
ئەڕا: [بەند] بۆ؛ بەخاتر؛ لەبەر؛ بۆچی. (چرا)
ئەڕابە: [ناو] فد: ئارەبانە؛ عەرەبانە؛ گاری؛ گاریە؛ عارەبانە. (ارابه)
ئەڕابەی دەستی: [ناو] (١) فەرغوون. (فرغون) (٢) ئەڕابەی دەستفرۆش. (ارابه دستی)
ئەڕابەی جەنگی: فد: [ناو] دەبابە؛ تانک (تانک)
ئەڕابەی کەڵی: [ناو] ئەڕابەی دوو تەگەرە کە جووتێک کەڵ گامێش ڕایدەکێشن، زیاتر بۆ کوڵۆش کێشان بە کاری دێنن. (ارابه بزرگ دو چرخ)
ئەڕاچووێ: بۆچی. (برای چه)
ئەرارات: > ئارارات. (آرارات)
+ ئەرامەنە: فد: (١) [ناو] کۆی ئەرمەنی. (جمع ارمنی) (٢) [ئاوەڵناو] لانەواز و هەژار؛ لەوانەیە لە تورکییەوە هاتبێ (<ئارامەندە) ئارامەنە؛ لەناودا گیرخواردوو؛ دەستەوسان. (فقیر؛ وامانده)
ئەرانە: [ناو] خەزێم؛ لووتەوانە. (زینت دماغ)
ئەراوەند: [ئاوەڵناو] ئاراوەند؛ بڵیند؛ بەرز. (بلند)
ئەربابانە: [ئاوەڵناو] (١) ئاغایانە؛ وەک ئەرباب. (ارباب اسا) (٢) [ناو] بەهرەی مالیکانە. (بهره مالکانه)
ئەرباب و ڕەعیەتی: [ناو،ت] ڕەوتێکی ژیانی کۆمەڵایەتی بوو کە ئەرباب خاوەنی زەوی و زار بوو (ارباب ورعیتی)
ئەربابی عیلم: فد: [ناو] خاوەنی زانیاری؛ (ب)

زانایان؛ زانیاران. (ارباب علم)
ئەربابیقەڵەم: فد: [ناو](ب) نووسەر؛ قەڵەم بە دەست. (ارباب قلم)
ئەربووش: [ناو]ئەسپی شێی سوور هوول. (کرنگ؛ سرخ رو)
ئەڕبە: [ناو]ڕبە؛ بەرانبەر بە۲/۵ کیلۆ دانەوێڵە؛ ڕبە: بەرانبەری شەش مشتی هەردوو دەست دانەوێڵە.(۲/۵ کیلوغله)
ئەرپیزە: [ناو]باوەشێن؛ بارموشە. (بادبزن)
ئەرتک: [ناو]ئەتک؛ سووکایەتی. (توهین)
ئەرتەش: [ناو]سوپا. هێزی عەسکەری لە دەوڵەتێکدا. (ارتش)
ئەرتەشبود: فد: [ناو]بانترین دەرەجەی نیزامی لە ئێراندا لە ڕابووردوودا. (ارتشبد)
ئەرتەشسالاری: میلیتاریسم؛ حکومەتی ئەرتەشیگەل. (ارتش سالاری)
ئە رتە شی: [ئاوەڵناو+ ناو](۱) پێوەندیدار بە ئەرتەشەوە؛ پۆتینی ئەرتەشی؛ فرۆکەی ئەرتەشی؛ سەیارەی ئەرتەشی. (۲) کەسێک-کە لە ئەرتەشدا (دەوام) شوڵ دەکا. (ارتشی)
ئەرجووم: [ناو] ئەرجوو؛ تکا؛ پاڕانەوە؛ داخواز؛ داوخواز. (خواهش)
ئەرخ: چاڵ؛ قووڵکە. (چاله)
ئە رخاندن: [چاوگەت]ماندووکردن. (خسته کردن)
+ ئەرخەوانسوور: [ناوەت](ب) ئەوەڵی بەهار کاتێک باران قوڕاو لەگەڵ خۆیدا دەرێژێتە ناو چۆم و ڕەنگی سوور دەکات. (اول بهار)
ئەرخەوانسووری بەهار: (ب) کاتێ کە چۆم هەڕەتی ئاو زۆریەتی. (موسم بهار که رودخانه گل آلودو پرآب است)
ئەرخین: ماندوو بوون. (خسته شدن)
ئەرده بێژ: [ناو]ئەردناس؛ زەویناس؛ خاک ناس. (خاکشناس)
ئەردەشێر: (۱) ڕق و قینی شێر؛ مەڵبەند و سەرزەمینی شێر. (خشم شیر.سرزمینشیر) (۲) ناوی ئەوەڵین شای ساسانی کە لەهۆزی کوردان بووە. (اولین شاه ساسانی که کردبوده)(۳) ناوە بۆ پیاوان. (نام مردانه)(۴) نەڕڕەی شێر؛<ئە ڕنین (نعره شیر)(۵)ئەرد واتا قسەڕاست؛ شێریڕاست و دروست.(حقیقت گو)
ئەردەک: [ناو]وڵاخی یەدەک کە سواریٚ بە دوای خۆیدا دەیکێشیٚ. (اسب یدک)
ئەردەڵ : بەجەرگ؛ دڵدار و نەترس بەجەرگ؛ (شجاع)
ئەردەڵان : (۱)کۆی ئەردەڵ؛ دلێران؛(دلیران) (۲)بنزاراوەی سنە و دەردۆری. (لهجه سنندجی)(۳)بنەماڵەی ئەردەڵان کە حوکماتی سنەیان بەدەست بوو.(خانواده امیران اردلان در سنندج)
ئەردموان : چاودێری زەوی؛ (نگهبان زمین)
ئەردهێژ: [ناوەت] بوومەلەرزە. (زلزله)
ئەڕڕا: [ناو] مشار؛ ئەڕڕە. (اره)
ئەڕڕەئەڕ: [ناوەت] زەڕینیکەر؛ عەڕ عەڕ؛سە-ڕینی کەر؛سەڕەسەڕ؛ (عرعر)
+ ئەرز: [ناو] پووڵی بیانی. (ارز)
ئە رزانجان: [ئاوەڵناو]هەرزانفرۆش؛ دژی گران فرۆش. (ارزان فروش)
ئەرزانفرۆش: فد: (۱)[ئاوەڵناو] ئە رزانجان؛

کەسێک کە شت هەرزان دەفرۆشێ.(٢) فرۆشی ماڵ یا مڵکێ هەرزانتر لە قیمەتی خۆی؛ ماڵەکەم ئەرزان فرۆش کرد. (ارزان فروش)
ئەرزان‌فرۆشی: فد: [ناو‌بەرهەمی چاوگە ] هەرزان‌جانی؛ دژی گران‌فرۆشی.(ارزان فروشی)
ئەرزان‌قیمەت: فد: [ئاوەڵناو+ ناو]کەم قیمەت؛ کەم‌بەها؛ کەم‌نرخ. (ارزان قیمت)
ئەرزانی: [ناو]هەرزانی؛ دژی گرانی. (ب) فەراوانی و نیعمەت. (ارزانی)
ئەرزرووم: فد؛ تد: باژێرێکی کورد نشینە لەتورکیا. (ارزروم)
ئەرزناس: [ناو،ت] ئەردبێژ. (زمین شناس)
ئەرزنج: [ناو]ئانیشک؛ ئانیسک. (آرنج)
ئەرزۆ: ناوە بۆ ژنان. (اسم دخترانه)
ئەرزەنجان: شارێکی کوردانە لە تورکیا. (ارزنجان)
ئەرزیل: [ناو]هەرزاڵ. (سکویی در اتاق یا چادر)
ئەرژن: [ناو] دارێکی بێبەرە.(نام درختی است)
ئەرژەنگ: (١) ناوی دێوی شانامە. (دیو شاهنامه) (٢) شەیتان. (شیطان) (٣) کتێبی وێنەی مانی پێغەمبەر. (کتاب نقاشی مانی)(٤) ترس؛ وەحشەت؛ خۆف. (وحشت)
ئەرژەنگی دێو: (١) ناوی دێوێکی ئەفسانەییە. (ارژنگ دیو) (٢) پیاوی زەبەلاحی پێدەشوبهێنن. (گنده بک)
ئەرس: [ناو]هرس؛ ئەسرین؛ ئەسر؛ ڕۆندک؛ فرمێسک.(اشک)
ئەرسیم: [ناو]مەسە؛ قەڵانگ؛ مەسێ؛ شیشی سەرتەنوور. (میله روی تنور)
ئەرشەک: [ئاوەڵناو] حەسوود؛ بەخیل؛ چکووس.(بخیل)
ئەرغەن: ناوی شارێکی کوردانە لە تورکیا. (ارغن)
ئەرغەنوون:[ناو] عد؛ فد؛ یونان‌د: جۆرێک ئۆرگی چووکەیە. (ارغنون)
ئەرغەوان: [ناو]ئەرخەوان. (ارغوان)
ئەرغەوانی‌سوور: [ناو]ڕەنگی ئەرخەوانی مەیلەو سوور؛ لە ئامێتە کردنی ڕەنگی شینی کەم و سووری زۆرتر و سپی پێکدێ. (ارغوانی قرمز)
ئەرفای:[چاوگە] ڕفاندن؛ فڕاندن. (ربودن)
+ ئەرکان: عد؛ فد: (١) ناوە بۆ پیاوان، زیاتر لە کوردستانی تورکیا.(٢) پێنج ڕێخراوەی پادگانی نیزامی (روکنی ١ و ٢ و٣و٤ و٥)کە هەر یەک ئەرکی تایبەتیان لە سەرشانە. (ارکان)
ئەڕک: ئامرازی سەر سووڕمانە. (کلمه ای برای تعجب)
ئەرکدار: [ئاوەڵناو]کەسێک کە کار و دەردیسەری زۆر بێت. (کار مشکل داشتن)
ئەرکە: (١)کاری‌گرینگ. (کاربزر گ)(٢) ئاگردان. کوانوو. شۆمینە. (شومینه)
+ ئەرگ: [ناو]بارەگای شاهان. (ارگ)
ئەرمان: [ئاوەڵناو] بەڕەحم؛ دلۆڤان. (مهربان)
ئەڕمان:[چاوگە،ت] ڕووخان؛ تێک‌تەپین؛ ڕمان؛ کەوتن؛ ڕمیان. (خراب‌شدن دیوار یا

خانه)
ئەرموود:[ناو]ئەمـروود؛ هـەرمـێ؛ هـەمـرۆ. (گلابی)
ئەرمەن:[ناو]هەرمەن. (ارمن)
ئەرمەنستان: وڵاتی هەرمەنستان. (ارمنستان)
ئەرمەنی:[ناو](۱) هەرمەنی؛ لقێ لە نیـژادی هێند و ئوروپایی. (ارمنـی)(۲) ئـەنـدامی ئـەو قەومە. (ارامنه)(۳) زبانیان. (زبان ارمنی)
ئەرمین:[ناو]ئەستێرەی قیبله؛ ئەستێرەیێـک کە لای باشوورەوە هەڵدێ. (ستاره جنوبی)
ئەرن:[ناو](۱) ئەرد؛ نەڕڕە. (نعره)(۲) قین؛ ڕک؛ کین. (کینه)
ئەرناف:[ناو]ڕق؛ کین؛ قین. (کینه)
ئەرناف‌لێچـوون:[چاوگـە،ت] ڕق نیشـتنەوە؛ ئارامبوون. (آرام شدن) ئـەرنانـدن:[چاوگـە-ت]زووێرکردن؛ چڕوساندنەوە؛ چەوسـاندنەوە؛ ئازاردان؛ ڕق‌هەڵساندن. (آزار دادن؛عصـبانی-کردن)
ئەڕناویت:[ناو]ئەڕنەووت؛ ئەلبانی؛ئاڵبانیـایی؛ (کشور آلبانی؛ آلبانیائی)
ئەڕنەبـووت:[نـاو] جۆرێـک مـەیمـوون کـە شێوە ی ئینسان دەدا. (میمون)
ئەڕنەمووتە:[نـاو]تـبلا نـاوەڕاسـت؛ قـامکی نێوەڕاست؛ هەڵمەقووتە. (انگشت‌وسطی)
ئەڕنـین:[چاوگـە]تـووڕەبـوون؛ ئازارکێشـان؛ ئەنرین. (عصبانی شدن)
ئەرۆ:[ئـامراز]هـەرۆ؛ ئـامرازی بانـگ‌کردنـی پیاوانە؛ ئەری؛ هەری. (صدا کردن مرد)
ئـەروەنـد:[نـاو](۱) حیلـە؛ فێـڵ‌وفـەرەج. (حیله)(۲) چۆمی ئەروەند لە باشووری ئێـران. (اروند رود)
ئەرەجێ:شێوە؛ لێچوون؛ لێکردن؛ وێچـوون؛ وەک؛ شێوەدان. (شبیه؛ پنداشتن)
ئـەرەجیـا: دەتزانـی؛ دەتگـوت؛ وەک؛شـێوە. (شبیه؛ پنداری)
ئـەرەجیـای:[چاوگـە]وازانـین؛ پـێ‌وابـوون. (پنداشتن.)
ئەرەق:[ناو](۱) عارەق؛ مەی. (می)(۲) خـۆ؛ ئارەقە. (عرق تن)
+ ئـەرەقگیـر:(۱)[ناو،بـک] کـەسـێک کـە هەڵمەتکێن دەکا.(عرق تقطیر کـن)(۲)[نـاو] ژێرکراس. (زیر پیراهن)(۳)[ناو] نەرمـەزیـن. (نمد زین)
ئەرەکۆتەی:[چاوگە]کەوتن. (افتادن)
ئەرەمداری:[چاوگە]ڕاوەستان. (ایستادن)
ئـەرەمـەرزیـای:[چاوگـە]ئـەرەمـەرزای؛ دامەزراندن؛ سەقامگرتن.(جایگیرکردن)
ئەرەمـەنـەی: لـە کارکـەوتـن و ڕاوەسـتان. ئارامەندی؛ ئارامەنەی؛ دەستەوسانی؛ تیامـان. (ایستادن؛ <ئەرامەنە
ئەرەنیای:[چاوگە]دانان. (گذاشتن)
ئەرەنیشتەی:[چاوگە]دانیشتن.(نشستن)
ئەرەودە:[ناو،بەر]ئاروینکراو؛ تـاقیکراو؛ جـە-ڕباندی. (آزمایش‌شده)
ئەرەوستەی:[چاوگە](۱) داخستن؛ پێـوەدان؛ بەستن. (بستن)(۲) پان کردنەوەی فەڕش و لباد. (پهن کردن)
+ ئـەرێ[دامـرازی بانـگ‌کـردن] هـەرێ ؛ئامرازی بانگ‌کردنی ژنان، بۆ پیاوان دەڵـێن ئەرۆ. (صدا کردن زن)

ئەرێز:[ئاوەڵناو] بەرین؛ پان‌وپۆڕ؛ لە عەریـزی ئارمویەوە هاتووە. (عریض)
ئەریڤان:[ناو] مەڵبەندی ئێرەوان؛ لـە پێشـدا کورد نشین بووە ئێستا پێتەختی ئەرمەنستانە. (ایروان)
ئەرێن:(١) نەڕڕە. (نعره)(٢) ئەنـدازە کـردن و پێوانەی کووتاڵ. (اندازه ای برای متر کـردن پارچه)
ئەرێنی[بەند]جوابی بەڵێ؛ ئەرێ. (جواب‌آری)
ئەرێ و نەرێ:بەلێ و نەخێر؛ (ب) دووشـک بوون؛ دوودڵ‌بوون. (آره و نه)
ئەزا:[ئاوەڵناو] ئازا؛ خێرا. (شجاع)
ئـەزانـێ:(١)دەزانـێ.(٢) دەسـتەواژە وەک ، پرسینی‌قیمەتی بزن، وەڵام :بزن‌دەزانـی واتـا چۆنییەتی و بارودۆخی بزن قیمەت دیاریـدە-کا.(١.میداند.٢.کنایی،وضعیت)
ئـەزایـی:[ناو،بـەرهـەمـی‌چاوگـە] ئـازایی. (شجاعت)
ئەزبە:[ناو]کەپسوول. (کپسول)
ئەزبەر:[ناو]بەمێشک‌سپاردن؛ لـەبـەر؛ حێفـز کردن؛ دەرسەکەم ئەزبەر کرد: دەرسـەکـەم لەبەرکرد. (حفظ)
ئەزبی‌کێویلە:[نـاو]نـەعنـای‌کێـوی. (نعنـای کوهی)
ئەزبێڵە:[ناو]نەعنا؛ جاترە. (نعنا)
ئەزبییە: [ناو]ئەزبێڵە؛ نەعنای‌کێوی. (نعنا)
ئەزپەرەست:[ئاوەڵنـاو]خـۆویسـت؛ خۆخـواز؛ خۆپەسەند. (خود خواه)
ئەزدین‌زەری[ناو](١)جۆرێـک هـەڵپـەڕکـێ. (نوعی‌رقص)(٢)جۆرێک‌قوماش.(نوعی‌پارچه)

ئەززا:[ناو]دایکە؛ دایە. (مادر)
ئەزاتە:[ئاوەڵنـاو] نـەزۆک؛ قسـر؛ ئـەسـتێور؛ ستێور.(نازا)
ئەززاوتاتە:[ناو،ت]دایک و باب. (پدر و مادر)
ئەززێ:[ناو]دایک و باب. (پدر و مادر)
ئەزغەنی:شارێکی کوردانە نزیکی دیار بەکر. (شهری نزدیک دیار بکر)
ئەزمان:[ناو]زمـان؛ ئاسـمان؛ زبـان. (زبـان. آسمان)
ئەزمان‌تاڵ:[ئاوەڵناو] قسەناخۆش؛ زمان‌پیس. (بدزبان)
ئەزمان‌تیژ:[ئـاوەڵنـاو]زمـان‌تاڵ؛زمـان‌درێـژ. (بدزبان.)
ئەزموو:[ناو، ئاروین؛ تاقیکردنەوە. (آزمون)
ئەزمەڕ: کێوێکە لـە پـاڵ شـاری سـلێمانیدا . (نام‌کوهیست درکنار سلیمانیه)
ئـەزمـین:(١)[نـاو] زەوی. (زمـین)(٢) [چاوگە]تام‌تاقیکردنەوە. چەشتن؛ چێژکـردن؛ چێشتن. (چشیدن)
ئەزەلیا: دەئاڵا؛ دەپێچرا. (می پیچید)
ئەزێ:[ئامراز](١) چما؛ داخۆ؛ تۆبڵێی. (تو گوئی)(٢)[جێناو] من؛ ئەمن؛ (من)
(٣) دەزێ؛ منداڵی دەبێ. (می زاید)
ئەزێچ:[جێناو](١) منیش. (منهم)(٢) لەو. (از او)
ئەزیچ:[جێناو]ئەز ژی؛ منیش. (منهم)
ئەزیماندن:[چاوگە،ت] عەزیماندن؛ ڕێز لێنان و میـوانی‌کـردن؛ حورمـەت‌گـرتن؛ خزمـەت کردن. (تکریم)
ئەزیەتکردن:[چاوگە،ت]عەزیەت‌دان؛ ڕەنج و

ئازار پێگەیاندن؛ ئەشکەنجەدان. (اذیت کردن)
ئەزیەتکێشان: [چاوگە،ت]زەحمەت قبوڵکردن؛ ڕەنج و ئازارکێشان. (زحمت کشیدن)
ئەژ: لە. (از)
ئەژدەر: [ناو](١) گوللەی ئەسڵەحەی ژێر دەریاییە. (اژدر زیر دریایی) (٢) هەژدیها؛ هەزیا؛ حەزیا؛ حەفی. (اژدها)
(٣) سەرە بەیداخ. (سر پرچم) (٤) ناوە بۆ پیاوان. (نام مردانه)
ئەژدەرئەناز: [ناوبک](١) پاپۆڕ یا ژێر دەریایی، کە خاوەنی کەرەستەی ئەژدەرخستنە. (٢) ئەسڵەحەیێک کە ئەژدەر دەخا. (اژدر افکن)
ئەژگەڵ: [ناو](١)هەژگەڵ؛ چڕوچیلکە؛ دڕک وداڵ. (خار و خاشاک) (ب٢) ئاکار ناشیرین؛ خوێڕی؛ ئاشخاڵ. (بی ارزش و بیکار)
ئەژمار: [پاشگر، ناوی‌بک]شمێر؛ کەسێ کە دەژمێرێت؛ ئەژمێر. (شمار)
ئەژمارە: [ناو،ت]ژمارە؛ ڕەقەم. (شماره)
ئە ژماردن: [چاوگە،ت](١) ژمارای؛ شماردن؛ بژاردن. (شمارش) (٢) بۆ تاوان‌دانەوە؛ تاوان بژاردن. (غرامت دادن)
ئەژمەت: [ناو]حەیبەت؛ هەژمەت؛ حەجمەت؛ تاو. (هیبت؛ ترس)
ئەژمێر: [ناوبک]ژمێر؛کاری ژماردن؛ کەس یان کەرەستەیێک کە ژمارە دەکا.(شمار)
ئە ژمێراو: [ناو،بەر]ژمێراو؛ بەحیساب‌هاتوو؛ (ب) پویتە پێدراو. (شمرده شده)
ئەژناس: [ناوئاوەڵناو] ئەشناس؛ شناس؛ ناسیاو؛ ناسراو؛ ناس‌کری. (آشنا)
ئەژنۆ پێ‌دادان: [چاوگە،ت] شکستپێ‌دان؛کۆڵ پێ‌دان؛ ئەژنۆپێدادان : بە ئەژنۆ پێداکوتان. (شکست دادن؛ بازانو ضربه زدن)
ئەژنۆ دادان: [چاوگە،ت](١) لە سەر چۆک دانیشتن. (نشستن بر روی زانو) (٢) کۆڵ دان و تێک‌شکان. (شکست خوردن) (٣) چۆک دادان؛ ئەژنۆ دانانە ئەرز. (زانو خم کردن)
ئەژنۆشکان:[چاوگە،ت](ب)بەڵای گەورە بە سەر هاتن. (مصیبت بزرگ نازل‌شدن)
ئە ژنۆشل‌بوون: [چاوگە،ت](ب) هیلاک‌بوون بە هۆی ڕاوەستان یا گەڕانی زۆرەوە. (کنایه از خسته شدن)
ئەژنەوا: [ئاوەڵناو] گوێ‌ڕایەڵ؛ شنەوا؛ ژنەوا؛ گوێ‌دەر؛ بیسەر؛ بەڵبەڵەگۆش. (شنوا)
ئەژنەوتن: [چاوگە،ت]شنەفتن؛ بیستن؛ ئەژنەفتن. (شنیدن)
ئەژمسەرێ: [ناو] نیوەشەو؛ بەینی نیوەشەو و بەری‌بەیان. (نیمه شب)
ئەژی: (١) دێنێ؛ دەشێ. (می ارزد) (٢) زیندووە. (زنده) (٣) مار. (مار)
ئەس: [کار،کردار]هەیە؛ هەس؛ گەورەس: گەورەیە. (است)
ئەسان: [ناوبک]کڕیار؛ ئەستێن. (خریدار)
ئەسپا: [ناو]ماهین؛ مایین؛ لەئاوێستادا ئەسپ و ئەسپا بۆنێر ومێی ئەسپ هاتووە.(مادیان)(٢) ئەسپەکان. (اسبها)
ئەسپاب‌کێشی: [ناو،ت](١) (ب) ماڵ-

گوێستنەوە. (خانە عوض کردن) (٢) کێشانی سامان و کەل‌وپەلی‌ماڵ یا(کۆمیٚ کەرەستە) لە جێگەیێکەوە بۆ جێگەیێکی‌تر.(اسبابکشی)
ئەسپار: شـێوکردنی زەوی بـە پێمـەڕە؛ کەسێک‌کـە دەسـپێرێت یـا ڕادەسـپێرێت. (شخمزدن‌زمین‌با بیل؛کسی‌کەمی‌سپارد)
ئەسپاو خەجاڵەت: هۆی شـەرمـەزاری؛ ئـەو دۆستەم بوو بە ئەسپاو خەجاڵـەتـم، بـوو بـە هۆی شەرمەزاریم.(اسباب‌خجالت)
ئەسـپاو زەحمـەت:ئـەسـپابی زەحمـەت؛(ب) بوونە هۆی زەحمەت. (اسباب زحمت)
ئەسپاو سەفەر: [ناوت]کەل‌وپەل و تۆشـەی ڕێگا. (اسباب سفر)
ئەسپاوکار: کەرەستە و ئەسپابی کار؛ ئامرازی کار جێبەجیٚ‌کردن.(اسباب کار)
ئەسپ تاودان: [چاوگە،ت] (ب) باڵ بە ئەسپ گرتنەوە؛ غاردانی ئەسـپ بـە ڕکێـف‌کـوت و چوارناڵ. (اسب تاختن)
ئەسپزە: [ناو]کەپەک؛ سپۆس. (سبوس)
ئەسپڕەس: مەیدان. (میدان) <ئەسپە ڕێز.
ئەسپسـواری: (١) سـواری ئـەسـپ بـوون. (سواری)(٢)ئەسپی سواری؛ئەسپی تایبـەتـی سواری. (اسب سواری)
ئەسپ گۆڕینەوە بە کەر: (ب) مامەڵـەی بـیٚ قازانج‌کردن. (معامله بی سود)
+ ئەسپەر: [ناو]متاڵ. سپەر. (سپر)
ئەسپەردە: [ناوی بەر]سپاردە. (سپرده)
ئەسپەردەکـردن: [چاوگـە،ت] سـپاردن؛ (ب) بـەخـاک سـپاردنی مـردوو. (سـپردن؛ دفـن کردن)

ئەسپەرەدار:[ناو]دارای ئەسپەرە؛ بێڵاسنیٚ کـە لـە خـوار دەسـکەکـەیـەوە جێگـای پـای- هەیە.(دارای جای پا در بیل‌آهن)
ئەسپەرەم: [ناو]ڕێحانە؛ ڕیون.(ریحان)
ئەسپەڕێز: [ناو]مەیدانەئەسپێک؛ ئەسپڕەس؛ ماوەیێک‌کە ئـەسـپ بـە یـەک غاربیگـاتیٚ. (میدانی‌برای‌رسیدن‌بایک‌ایلغار)
ئەسپەژن: [ناو]ژنی باڵابەرز و شـۆخ. (زن قـد بلند و ملنگ)
+ ئەسپەک: [نـاو]پێشـەوەی سـەیـارەی ١٨ تەگەری باری (کەفی) کە پاشی سـەیـارەی پێوە دەبەستریٚ. (اسپک)
ئەسپەمار: [ناو]توولە مار. (مار باریک)
ئەسـپەنـەک: [نـاو]ئـەسـپەک؛ نـەخۆشـینی کەوتەیی؛ گرانەتا. (تیفوس)
ئەسپ هـەڵگـرتن: [چاوگـە،ت] سـواریٚ‌کـە ئەسـپی سـەرکـێش دەیڕفێنێـت وسـواربۆی ناوێستێتەوە. (اسب برداشتن)
+ئەسپیٚ: [ناو]سپیٚ؛ جانەوەرێکە کە لـەشـی ئینسان(بە هۆی‌پیس و پۆخڵییەوە)هەڵیـدێنیٚ دوو جۆرە(١)ئەسپێی‌سەر کە ڕەنگی ڕەشـە و نابێتە هۆی گیرۆیی و ڕاگوێزانی نـەخۆشـینی ئەسپەک.(٢)ئەسپێی لەش‌کە ڕەنگی سپییە و هووڕگی ئەسپەک لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر ڕادەگوێزیٚ و دە بێتـە هـۆی بڵـاوبوونـەوە وپەرە سەندنی (ئێپیدێمی) تیفـووس یـا ئـە- سپەک. (شپش)
ئەسپیئـاوی: [نـاو]جانـەوەرێکـی گیـاخۆری دەست و پیٚ‌کـورتی ئاوییـە لـە کـەرگـەدەن دەکات، بەڵام شاخی نییە. (اسب آبی)

ئەسپی ئەبڵەق:[ناو]ئەسپی دوو ڕەنگ کە پەڵەی گەورەی سپی و ڕەش یان سپی و سوور لەشیداپۆشیبێ. (اسب‌ابلق)
ئەسپی باری:[ناو]ئەسپی تایبەت بۆ بار کێشان. (یابو)
ئەسپی‌بوخار[ناو] فلا یەکەی پێوەرەی هێز لە مەکینەکاندا بەرانبەر بە ۷۴۷/۸ وات. (اسب بخار)
ئەسپی‌بۆرە[ناو]ئەسپێک کە ڕەنگی بۆر بێت. (اسب نیله)
ئەسپی‌بەدڕکێف:[ناو] ئەسپێک‌کە سواربوونی ناخۆشە و بەد ئاوزەنگییە؛ ئەسپی‌سەرقورس و نافەرمان. (اسب بد رکاب)
ئەسپی تەعلیم (تالیم) دراو:ئەسپێک کە چاک بارهاتووە و فێری سواری(داِن) کراوە؛ (ب) خۆش‌ڕەوت. (اسب تعلیم دیده)
ئەسپی چەپ:[ناو] ئەسپێک کە لاقێکی سپی و سێ‌لاقی ڕەش‌بێت. (اسب چپ)
ئەسپی چەپەرخانە:ئەسپی پۆستخانە. (اسب چاپار)
ئەسپی چەخمور:[ناو] ئەسپێک‌کە ڕەشێنەی چاوێکی ڕەش و هی چاوەکەی دیکەی قاوەیی یا ڕۆشنتربێ. (اسب چخمور)
ئەسپی خۆشبەز:[ناو] ئەسپی بەکار و ئازا کە درەنگ هیلاک و ماندوو بێ. (اسب با استقامت)
ئەسپی خۆشڕەوت:ئەسپی‌کە بێ‌جیفڕک و هەڵبەز و دابەزە و سواربوونی‌خۆشە و سوار هیلاک ناکات. (اسب خوش قدم)
ئەسپی خەزاڵ:ئەسپی‌کە ڕەنگی وەک ڕەنگی ئاسک بێ. (اسبی کە رنگش مانند رنگ آهو باشد)
ئەسپیدار:[ناو]سپیدار؛ چنار. (سپیدار)
ئەسپی دووڕەگ:ئەسپی‌کە لە دوو نیژاد بێ. (اسب دو رگە)
ئەسپی ڕاست:ئەسپی‌کە لاقێکی ڕەش و سێ‌لاقی سپیبێت. (اسب راست)
ئەسپێردراو:[ناوی بەر]سپاردراو؛ شتی‌کە درابێتە دەستی‌کەسێک؛ سفارش‌کراو؛ ئەوکوڕە بە تۆ ئەسپێردراوە ئاگاتلێی‌بێ. (سپردە شدە)
ئەسپی‌ڕەسەن:(۱) (ب) ئەسپی چاک و کەحیل. (۲) دارای‌ڕەسەنی‌ناسراو؛ وەک ئەسپی عەرەبی؛ یا ئەسپی ئارییەن کە نیژادی ئەسپی کوردە {ئەسپی ئارییەن حەقی بەشداریشی لەکێبەرکێ کانی جیهانیدا نییە، (بەداخەوە هۆکەی نازانم)} (اسب اصیل)
ئەسپی ڕەوەک:ئەو ئەسپەی کە لەغاوی بەربێت دەتاریٰ و هەڵدێت. (اسب فراری؛ اسب رموک)
ئەسپی زینکراو:(۱) ئەسپیٰ کە زین کرابێت. (اسب زین کردە)(۲) (ب) ئامادە بوونی‌کەسێک بۆ کردنی‌کارێک؛ حازر بەدە ست. (آمادە)
ئەسپی‌سپی:ئەسپی یەکدەست سپی ڕەنگ؛ سپیلک. (اسب خنگ)
ئەسپی‌سرک:ئەسپی ترسەنۆک و سڵ. (اسب رموک و ناآرام)
ئەسپی سواری:ئەسپی تایبەت بۆ سوار

بوون. (اسب سواری)

ئەسپی سوورخون: ئەسپی سووری ئاچخ بە پەڵەی سپی و چکۆڵە چکۆڵەوە. (اسب قرمز با گلهای سفید)

ئەسپی سەرکێش: ئەسپی نافەرمان؛ ئەسپێک کە بەزەحمەت بۆ سوار دەوێستێتەوە و بە مەیلی خۆی سەر پێوەدەنێ و دەڕوا. (اسب سرکش)

ئەسپی سەمەند: ئەسپێک کە ڕەنگی زەردی کاڵ بێ؛ ڕەنگی ئەسپێک کە سوهراب کوڕی ڕۆستەم سواری بووە. (اسب سمند)

ئەسپی سەمەندی یاڵ وکلک شۆراو: ئەسپی یەزیدی؛ ڕەنگی ئەسپی یەزیدی کوڕی موعاویە کە ڕەنگی زەردی کاڵ بووە و یاڵ و کلکی سپی بووە. (سمند یال‌ودم‌شسته)

ئەسپی شا: لە شەترەنجدا ئەسپێک کە نزیکترە بە شا. (اسب شاه)

ئەسپی شەروور: ئەسپی چەمووش و بێ ئۆقرە و تووش و گازگر و جووتە وەشێن و بە-هەڵبەز و دابەز. (اسب چموش)

ئەسپی شێ: ئەسپێک کە هەموو لەشی ڕەنگی خورمایی ئاچخ بێ. (اسب کرنگ یا کرند)

ئەسپی شین بۆر: ئەسپی بۆرەی ڕەنگ مەیلەوشین. (اسب ابرش)

ئەسپی عەرەبی: لە ڕەسەنی ئەسپی ئاریەن (نیژادی ئەسپی کورد)ە کە لە قەدیمەوە لە عەرەبستان تەربیەت کراوە و ڕاهاتووە و ئەلعان بە ناوی ئەسپی تازی یا عەرەبی دەناسرێت و ئەسپێکی بەتاقەت و تابشتە و کورتەباڵا و دیمەن جوانە. (اسب عربی)

ئەسپی فایتوون: ئەسپی دروشکە. (اسب درشکه)

ئەسپی قەرەبۆرە: ئەسپی ڕەش بۆرە؛ ئەسپی شین بۆر کە گوڵ گوڵ خاڵی شینی تۆخی تێدابێ. (اسب نیله ابرش)

ئەسپی قەرەکوێت: ڕەش کوێت؛ ئەسپی کوێتی مەیلەو تاریک، کە ڕەشاییەکەی لە دامێنەوە تا نزیک سەرپشتی دە وامی هەبێ. (اسب‌قره کهر)

ئەسپی کوێت: بەغەیری ڕەنگی بۆرە و شین بۆرە و سپی و ڕەش و سەمەند هەر ئەسپێ کە یاڵ و کلکی مەیلەو ڕەشی تۆخ یا ڕەش بێت، کوێتە بەڵام وابـاوە، بەتایبەت هەر بە شێی تۆخ دەوترێت. (اسب کهر)

ئەسپی کوێتی دامێن تاریک: ئەسپی کوێت کە ڕەنگی دەست و پای ڕوو بە خوارەوە بەرە بەرە ڕەشتربێت. (لە هەر ڕەنگێ بۆ ئەسپ پەسندترە. (اسب کهر دست و پاسیاه)

ئەسپی کێبەرکێ: ئەسپی گرێو؛ (١ئەسپی پەڕش؛(ئەسپی پەڕین و بازدان). (٢) ئەسپی (کوورس)و توندڕەو بەتایبەت لە غاری تیژ و توندا بۆ (گریوەغار) گریوە وڵاخ. (اسب مسابقه)

ئەسپی موراد: سواری ئەسپی موراد بوون (ب) شانس و هات ڕووی کردبێتە کەسێک؛ کامڕەوایی؛ ژیانی خۆش و بەدڵ و ڕۆژگار بەدڵ چەرخان. (اسب مراد)

ئەسپی مەڕی: ئەسپێک کە ڕەوتی ڕۆیشتنی شێوەی ڕۆیشتنی مەڕ دەدا و زۆر نەرم و خۆش دەڕوات. (اسب قدم تند)

ئەسپی نەگیراو: (١) ئەسپی ڕام نەکراو؛ تۆڕ. (اسب رام نشده) (٢) ئەسپی٘کە فێری سواری نەکرابێت. (اسب رام نشده)(٣) ئەسپی وەحشی و ئازاد؛ ئەسپی کێوی‌کە نەگیرابی٘. (اسب‌وحشی)
ئەسپی‌وەزیر: ئەسپی٘کە لە شەترەنجدا نزیکی وەزیرە. (اسب وزیر)
ئەسپی وێرغە: ئەسپی٘کە ڕەوتی وێرغەیە و نوقسانی و نەخۆشینی شان و مل زیاتر لە ئەسپی وێرغەدا دەبینرێت. (اسب یورغه)
ئەسپی‌یۆرتمە: ئەسپێک کە بەڕەوتی گورگەلۆق دەڕوا؛ ئەسپی قۆرتە. (اسب یورتمه)> یۆرتە، یۆرغە
ئەسپێی‌برنج: جۆرێک ئەسپێیە لە برنج دەدا. (شپش برنج)
ئەسپێی‌گامێش: [ناو]جۆرێک ئەسپێی‌ڕەش و گەورەیە لە جنسی ئەسپێی‌سەر لە لەشی گامێش پەیدادەبێت. (شپش گاومیش)
ئەسپێی‌گەنم: جانەوەرێک‌کە گەنمی کۆن هەڵیدێنی٘. (شپش گندم)
ئەسپێی‌مامر:جۆرێک سپێی وردی‌باریکە لە لەشی پەلەوەردا پەیدادە بێت. (شپش پرنده)
ئەسپێی‌مریشک و بزن: جۆرێک ئەسپێی شینە؛ شینکە. (شپش بز و مرغ)
ئەسپی‌یەکەناس: ئەو ئەسپەیە کە تەنیا بە یەک کەس، (خاوەنەکەی) ڕکێف دەدا. (اسب یک‌ران)
ئەستار: [ناو]ئەستەڕ؛ ئاستەڕ. (آستر)
ئەستارە: [ناو]ئەستێرە؛ هەسارە. (ستاره)
ئەستان: [ناو]بەردەسماتە؛ هەسان؛ هەستان؛ بەردی تیژکردنی تێخ. (فسان)
ئەستان: [ناو]جستان؛ جسان؛ زستان؛ زسان؛ زمسان. (زمستان)
ئەستر: [ناو](١) هێستر، ئێستر. (استر) (٢) دڕوو. (خار)
ئەستڕاو: [ناوبەر] سڕاو؛ پاکەوەکراو؛ سڕیاو.(سترده)
+ ئەستڕان: [چاوگە]سڕین؛ ئەستڕین؛ پاک کردنەوە (ستردن)
+ ئەستری: [ناو]دارێکی دڕکاویە دوو باڵاپیاو بەرز دەبێتەوە.(درختیست خار دار)
ئەستری‌زەردکە: [ناو]دڕوەزەردە. (نوعی خار)
ئەستریشک: [ناو]سرێش؛ لە هاڕینی بنەگیای خوژە دروستدەکرێت.(سریش)
ئەستۆبەند: [ناو](١) تەوقەی‌مل؛ ملوانکە. ملوێنک. (گردن بند) (٢) > ئاتیل. (آتل)
ئەستۆکورد: [ناو]ملەقۆچە؛ ملەقووتە؛ قۆجەملە. (گردن پرنده)
ئەستوورکان:[ناو،ت]ڕیسی ئەستوور؛ دژی باریکان.(ریس ضخیم)
ئەستوونەزێڕینە: [ناو]ئەسوونەزێڕینە؛ کۆڵکەزێڕینە؛ کەسکەسوور؛ پەلکەزێڕینە؛ ئەستوونەزێڕینە؛ کوڵەکەزێڕینە؛ دوای باران کە خۆر لە هەڵمی چڕی ئاسمان دەدا بەهۆی شکانەوەی تیشکی خۆر حەوت ڕەنگ دروستدەبی٘ کەدەبێتە کەوانێکی حەو ڕەنگ لە ئاسماندا. (رنگین کمان. قوس و قزح)
ئەستووری: [ناو]قەوییایەتی؛ بارستا. (کلفتی)
ئەستەڕ: [ناو]ئاستەڕ؛ بەرە؛ بەر. (آستر)
ئەستەڕک: جۆرێک هەرزاڵی چوارپایەیە.

(نوعی سکو در دهات با چهار پایه)
ئەستەرە: [ناو]ئەستێرە؛ (١) گۆیئاسمانی کە بەرواڵەت لە مانگ چکۆلە ترن و شەوانە لە ئاسماندا دەدرەوشێنەوە.(٢) ئەستێرەی پەنج-پەڕ و هەشت پەڕ: دەرەجەی ئەفسەر لە ئەرتەشی ئێراندا. (٣) هەر شتی پەنج پەڕ دروستکراو بەشکڵی ئەستێرە.(٤) ئەکتەری پایەبەرز و ئوڕناک و نموونەکار؛ ئەستێرەی سینەما.(ستاره)
ئەستەموولی: [ناو](١) جۆرێک پڵاو بە قیمە و پێرەلماسی و تەماتەوە.(نوعیپلوبا قیمەو سیبزمینی وگوجه فرنگی)
(٢) دەفریقوڕکێشان لە بەننایيدا. (ظرف-جابجاییگل) (٣) [ئاوەڵناو]پەیوەندیدار بەئە-ستەموولەوە؛ خەڵکی ئەستەموول. (اهل استانبول)
ئەستێرەشەلە: [ناو]ئەستێرەیێکی کزە لە کلکەی حەوتەوانان هەڵدێت.(نامستارەایست)
ئەستێرەی قیبلە: [ناو]ئەستێرەیێکە لەباشووریئاسمان و ڕوو بەقیبلە هەڵدێت. (ستاره ای رو به قبله)
ئەستێرەیکاروانکوژە: [ناو]ناوی ئەستێرەیێکە. (نام ستاره ای است)
ئەستێرەیکلکدار: [ناو]ئەستێرەیێک کەدەخوشێ؛ ستێرابدوٚڤ.(ستارەدنبالەدار.)
ئەستێلک: [ناو]ئەستێولک. (میلەآهنرویتنور)
ئەستێم: > ئەستێولک.(آهن رویتنور)
ئەستێولک: [ناو](١) کاردەکیپان بۆ پاک کردنەوە و ڕنینی هەویری قەراخ سوێنە. (کاردک پهن)(٢) ئاسنێکی درێژە بەسەر تەنووردا ڕایدەکێشن بۆ ڕاگرتنی مەنجەڵ. (آهنی دراز که روی تنور میگذارند)
ئەسرار: [ناو]تریاک. (تریاک)
ئەسرارکێش: [ئاوەڵناو+ ناو]تریاکی؛ تریاک کێش. (تریاکی)
ئەسروٚچڵک: [ناو]کەلەشاخی ڕۆنی دروێنەوانان. (روغندان از شاخ)
ئەسروٚڵک: [ناو]کەلەشاخی ڕۆن؛ ئەسروٚ چڵک. (روغندان از شاخ گاو)
ئەسرەموٚک: [ناو]گلێرکە؛ گژنیژە؛ دەنکە بەفری وشک و ورد و خڕ کە لە تەرزەی چووک دەکا. (دانه گرد و کوچک برف. بژ)
ئەسڕین: [چاوگە]سڕین؛ پاککردنەوە بەدەستماڵ یا شتی تر. (ستردن)
+ ئەسکڵ: [ناو]ئێسکیڕان.(استخوان ران)
ئەسکوند: [ناو](١) حاڵەتی ڕاوەستانی جگ (قاپ) لە سەر کەڵە. (حالت ایستادن شتالنگ روی کله)(٢) بەرزایی. (بلندی)
ئەسکوو: لە کوێیە؛ ها لەکوێ. (کجاست)
ئەسکە: [بەند]ئەوکاتە؛ ئەو وەختە. (آنوقت)
ئەسکەرلەتی: [ناو]جۆرێک قوماشی چاک لە قەدیمدا بۆ جلو بەرگی پیاوان. (نوعی پارچه مرغوب مردانه قدیمی)
ئەسکەری: (١) عەسکەری. (سربازی) (٢) جۆرێک ترێی بێناوک. (انگور عسکری) (٣) پێوەندیدار بە عەسکەرەوە. (نظامی)
+ ئەسکەلە: [ناو]داربەست؛ چێوبەست؛ بۆ سواخدانی دیواری بەرز دروستی دەکەن. (داربست)

ئەسکەنج: [ناو]ئەشکەنجە. (شکنجه)
ئەسکەوسەرە: [ناو]کەوچکەقوڵە. (نوزاد قورباغه)
+ ئەسڵ: [ناو]عد؛ فد؛ تد: (۱)عەسڵ؛ بنەما؛ ماک؛ بنەڕەت؛ ڕەگەز؛ بناغە؛ ئەساس؛ ڕەسەن؛ ڕەچەڵەک؛ نیژاد؛ بنەچەقە؛ بنەچەک. (۲) دەستووری پەژێرداو وەک: ئەسڵی ئەرەشمیدۆس لە هیندسەدا. (۳) دژی بەدەل؛ وێنەی ناسنامە بە کارناییێت ئەسڵی ناسنامەکە پێویستە، ئەو یاقووتە ئەسڵەیا بەدەلە. (۴) بنەما؛ ئەساس؛ گرینگترین؛ وەک: ئەسڵی‌کار زاوایە لە شاییە کەدا. (۵) سەرەتا؛ بناغە؛ من لە ئەسڵدا پێم خۆش نەبوو ئەوکارە سەربگرێت. (اصل)
ئەسڵان: تد؛ عد؛ فد: (۱) ناوە بۆ پیاو؛ (اسم مردانه) (۲)ئەم وشەیە ئارەویە: شێر. (شیر درنده)
ئەسڵی: [ئاوەڵناو] (۱) پێوەندار بەعەسڵەوە؛ بنەڕەتی؛ بنچینەیی؛ سەرەکی (اصلی) (۲) گرینگ؛ بنەمایی؛ ئەساسی؛ دژی فەرعی و شاخ و بەرگ؛ لقی ئەسڵی چەند شاخەی لێ-جیا بووەتەوە. (اصلی؛ مهم) (۳) ڕاستی و سەرەکی و بونیادی؛ شۆڵی ئەسڵیت چیە؟ قسەی ئەسڵیت چیە؟ (اصلی)
ئەسڵی بەقای ماک و ووزە: ماک و وززە دوو بنەمان کە هەتا هەتایە هەر دەمێنن و نافەوتێن؛ جێگۆڕکێ‌دەکەن و دەبنە یەکتر بەڵام لە بەین ناچن؛ (ئەسڵی‌پەژێر دراو لە کیمیادا). (اصل‌بقای ماده وانرژی)
ئەسڵی‌بێتاوانی: بنەمای بێسووچی: تا کاتێک تاوان لە سەرکەسێک ئیسپات نەبێت بێتاوانە. (اصل برائت)
ئەسڵیەت: ئەجدادم هەر خەڵکی سەقز بوون (بووون‌بووگن) و منیش ئەسڵیەتم هەر سەقزییە. (اصلیت)
ئەسمبلی: [ناو] زبانی پرۆگرام نووسینی کامپیوتێر. (زبان برنامه نویسی کامپیوتر)
ئەسواران: [ناو] فد: گورهانی هێزی عەسکەریی ئەسپسوار یا ژاندارمەی ئەسپسوار، لە سیّ‌دەستەی ۲۷ کەسی پێکدەهات؛ لە ڕابووردوودا. (اسواران)
ئەسوور: [ناو]سەوزەوات؛ گیا وگژی خواردەمەنی. (سبزی خوردن)
ئەسوون: [ناو]چیلکە و داری دەرگای قەفەزی دارین کە دەرگای ڕکە دەکاتە دوو کەرت و کەوی پێداناچێت (فڕندەی‌نێو قەفەزی‌پێدا ناچی). (شاخه درخت قفس چوبی)
ئەسوەن : ئەسپەن؛ ئەسپەندەر (اسپند)
ئەسە: [بەند]هەردەبێ؛ ئەمەسە؛ ئەمەیە. (باید بشود؛ این است)
ئەسەد: [ناو]عد؛ فد: (۱) پێنجەمین‌مانگی ساڵی مانگی بەرانبەر بە مانگی مورداد لە ساڵی هەتاویدا. (مرداد) (۲) ناوە بۆ پیاوان. (نامی مردانه)
ئەسەل: [ناو](۱) ئەسپ. (اسب) (۲) هۆ؛ مایە؛ بۆنە. (بخاطر)
ئەسەی: [چاوگە]سەندن؛ کڕین. (گرفتن؛خریدن)
ئەسیتۆن: [ناو]ناوی تراوێکی بێڕەنگ، بۆ لا بردن و تاوانەوەی لاکێ کە ژنان لە

ناخوونیانی (نانووخ) دەدەن.(استون)

**ئەسێح:** [ئاوەڵناو]ڕاست؛ میزان؛ دروست؛ خەبەری ئەسێحم هەیە: خەبەری ڕاستم هە-یە(دقیقا)

**ئەسیر و عەبیر: فد:** [ناو،ت] ماتڵ بوون و گرفتار بوون و دەستەوسان بوون بە دیار شت یا کەسێکەوە.(اسیر)

**ئەشپا:** [ئاوەڵناو]بەرزتر؛ چاکتر.(بهتر و بلند تر)

**ئەشتر:** [ناو]شەتڵ بۆ چەقاندن.(نشا)

**ئەشتوور:**[ناو]وشتر؛حێشتر.(شتر)

**ئەشتەبا:** [ئاوەڵناو،جێناوبەند] هیچ؛ هیچ شتێک.(هیچی)

**ئەشرمە:** [ناو،بەر] لووتبڕاو؛ کەپۆبڕاو.(دماغ بریده)

**ئەشرەف: عد؛ فد:** وشە ئارەوییە، (۱) شەریفترین ؛ بەڕێزترین؛ ماقوڵترین.(اشرف)(۲) ناوە بۆ پیاوان و ژنان.(نام زنانه و مردانه)

**ئەشقونج:** [ناو]ئەسکوند.(بلندی)

**+ ئەشقەمە:** [ناو] ورگ؛ ئەشکەمە؛ ئەشکەمبە؛ گەدە.(شکمبه)

**ئەشقەمە ماسای:** [چاوگ،ت]زگ-ماسیانبادکردنشکم)

**+ ئەشک:** [ناو](۱) ئەسرین؛ فرمێسک.(اشک) (۲) لە کاری سەنگچنیندا بە بەردی چکۆلە دەڵێن کە دەیخەنە بەینی درزی دوو بەردی گەورە بۆ قایمبوون.(سنگ کوچک بین درز دو سنگ بزرگ)(۳) چەرمی شۆر بووی ژێر زگی گا؛کێرەوڵ(پوست زیر شکم گاو) (۴) جۆرێک قوماش کە لەتە مووروی بێرەنگی شەوقداری پێوەلکابێت لە شێوەی دڵۆپەی فرمێسک؛(نوعی پارچه) (۵) پرپرەی شووشەی چلچرا؛ ئاوێزە کە بە شکڵی دڵۆپە ئاو یا دەنکەفرمێسکبێ.(آویزه لوستر) (۶) مرۆڤی دەست ولاقکورت.(دست و پا کوتاه)

**ئەشکاف:** [ناو]گەنجە؛ دۆڵابی؛ کۆمۆدی دیواری.(گنجه)

**ئەشکانی،یائەشکانیان:** [ناو]تایفەیێک لەشا و دەسەڵاتدارانی ئێرانیبوون.(اشکانیان)

**ئەشکەپووز:** ئەشکەبووس؛ ناوی قارەمانێکی شانامەیە.(اشکبوس)

**ئەشکەر:** [ئاوەڵناو] ئەشکەرە؛ ئاشکرا؛ دیار؛ خوویا؛ بەرچاو.(آشکار)

**ئەشکەفتە:** [ئاوەڵناو] گێل؛ حۆل؛ نەزان؛ بێ ئاوەز؛ نەفام.(نفهم)

**ئەشکەنجە:** [ناو]ئازار؛ ڕەنج.(شکنجه)

**ئەشکەنە:** [ناو]مزراویلکە؛ مزرۆکە(اشکنه)

**ئەشکەو:** [ناو]تەبەکیدارینی هەویر؛ تەشتی دارین بۆ ڕاگرتنی هەویر یان نان.(طبق چوبی جای خمیر)

**ئەشکێرک:** [ناو]شلکێنە(غذائییاتخممرغ و روغنوآرد)

**+ ئەشکێڵ:** [ناو](۱) ئشکێڵ؛ دەسەڵات؛ توانایی.(توانایی) (۲) فە رمان.(فرمان) (۳) دارێک کە دەخرێتە پشت دەرکە بۆ داخستنی دەرکە. (چوب پشت در) (۴) ئازار دان و ڕیسواکردن.(رسوا کردن) (۵) قوڵفە و ئاڵقەیڕەشماڵ(حلقچادر) (۶) سەمەندوک کردنی گیانلەبەرانی چوارپێ و بەستنی

دەست و پێیان بەشێوەی ڕاست و چەپ. (دست و پا بستن حیوانات) (۷) بەستنەوەی- سپلۆت یا زنجیری بەستنەوەی سەگ. (قلاده)

ئە شکێلکە: [ناو]شلکێنە. (خوراکی باروغن و تخم مرغ وآرد)

ئەشکیلۆک: [ناو]تۆکڵ؛ تۆخڵ؛ تێکوڵ. (پوسته)

ئە شم: [ناو]کەری شین ڕەنگ؛ کەری (شین- کەوە). (الاغ کبود تیره رنگ)

ئەشناسای: [چاوگە]ناسین. (شناختن)

ئەشناسنای: [چاوگە،ت]ناساندن. (شناساندن)

ئەشنە: [ناو]گوێژ؛ گێوژ. (زالزالک)

ئەشنیا: [لەچاوگەی شنیان]دەشنایەوە؛ دەشنیاوە؛ وەک: لەرینەوەی پەرچەم و گیا بەدەم باوە.(دراهتزازبود)

ئەشەدوو: کورتکراوەی ئەشهەدوو بیللا. (مخفف اشهد بالله)

ئەشەدو مەشەد: بۆتاریف کردنە؛ (ب) ئای لەو کارەچەن باشە. (به به)

ئە شێ: (۱) دەژییێت؛ دێنێت. (می ارزد)(۲) دەبێ؛ مەشیو؛ ئەشێ وابێ:دەبێ وابێ. (باید)

ئە شیا: [بەند](۱) ئەژیا؛ دەیهێنا. (می ارزید) (۲) مەشیا؛ دەبوو؛ ئەشیا وابووایە. (می بایست)

ئەشیف: [ناو]بژار؛ گژو گیای زیادی ناو زەرحات. (وجین. علف هرز)

ئەفتەو: [ناو]ڕۆژ؛ خۆر. (خورشید)

ئەفتەوبەر: [ناو](۱) چەتر. (چتر)(۲) سەیوان. (سایه بان)

ئەفتیار: [ناو]کەمتیار. (کفتار)

ئەفچکانن: [چاوگە،ت]جیق دەرهێنان؛ تلیقاندنەوە. (له کردن)

ئە فچکین: [چاوگە]تلیقیان؛ تلیقان؛ جیق- دەرهاتن. (له شدن)

ئەفراسیاو: (۱) ئەفراسیاب؛ پاڵەوانی تووارنی کە دژی ڕۆستەم شەڕی کردوە. (افراسیاب) (۲) ناوە بۆ پیاوان. (نام مردانه)

ئە فراندن: [چاوگە،ت]ئافڕاندن؛ خولقاندن؛ دروستکردن. (خلق کردن)

ئەفریقا: قۆرنەی ئافریقا؛ کەرتێ لەپێنج کەرتی وشکایی گۆی‌زەوی. (قاره آفریقا)

ئەفریقائی: خەڵکی ئافریقا. (آفریقایی)

ئەفریی: [ناو]هێلم؛ چەسپی دارتاشی؛ کە لە پێست و خوێن و ماسی چێدەبێت. (سریشم)

ئەفسار: [ناو]فد: لە ئاوێستادا (ئەئێوسار) هاتووە، هەوسار؛ هەفسار. (افسار)

ئەفسان: [ناو]هەسان؛ بەردەسان؛ سان.(فسان)

ئەفسانە: [ناو]فد: (۱) ناوە بۆ ژن. (نام زنانە) (۲) حەکایەت؛ سەرگوزەشتەی دەستکردی خەیاڵی و دوور لەڕاستی؛ چیرۆکی خەیاڵی. (افسانه)

ئەفسانەساز: فد: [ناوبک](۱) کەسێک کە چیرۆک سازدەکا. (۲) (ب) درۆ و بوختان‌ساز. (افسانه ساز)

ئە فسانەیی: [ئاوەڵناو] فد: (۱) لەباوەڕدا نەگونجاو؛ (۲) گرێدراو بە ئەفسانەوە: قارەمانی ئەفسانەیی.(افسانەئی)

+ ئە فسوونگەر: [ئاوەڵناوی بک،ناوی بک،] فد:

جادووبـــاز؛ ســـێحرباز؛ چاوبـــەس؛ (ب) عیشوەگەر. (افسونگر)
+ ئەفسەر: فـ‌د: [نـاو](١)خـاوەن مـەقـام و پایەی عەسکەری لە سیتوانیار بـەرە و ژوور؛ (افسر) (٢) ناوە بۆ ژنان.(نام زنانە) (٣) کڵاو و تانجی پادشایان. (افسر. دیهم)
ئـەفسـەری:[نـاو] فـ‌د: (١) کـار و شـوڵی ئـەفسـەری. (٢)[ئـاوەڵنـاو] پێـوەندیـدار بەئەفسەرەوە؛ وەک زانسـتگای ئـەفسـەری، بەرگی ئەفسەری. (افسری)
ئـەفسـەری جـوزء: فـ‌د: (ب) سـیتوان و سەروان. (افسر جزء)
ئەفسـەری‌جێنشـین: ئـەفسـەرێـک کـە لـە نـەبـوونی ئـامر (فـەرمانـدە)دا بریکـاری بـە ڕێوەبردنی کاروباری پادگان دەبێ بۆ مـاوەی ٢۴ کاژێر. (افسر جانشین)
ئەفسەری‌ستاد: فـ‌د؛ (١) ئـەفسـەرێـک‌کـە زانسـتگای‌شـەڕی (جـەنگـی) دیبێـت. (٢) ئەفسەرێک‌کە لـە ڕێخـراوی سـتاد دا شـوڵ دەکات. (افسر ستاد)
ئەفشار: [ناو](١) خانەی پێنجەمی تەختەنەرد. (افشار) (٢) مەنتەقـەی هـەو شـار. (منطقـە افشـار) (٣) مـەقـامی ئـاوازی ئـەفشـار لـە مۆســـــیقادا. (دســــتگاه افشــــاری در موسیقی)(۴)تەوژم؛ زۆر (فشار)
ئەفشـاربۆهێنان: زۆربۆهێنـان؛ تـەنـگ‌پێهـە ڵچنین. (فشار آوردن)
ئەفشاری:[نـاو] فـ‌د: مـەقـام و دەزگـاییێکی مۆسیقاییە. (افشاری)
ئەفشین: سەردار و ئامرێکی موعتەسەم خەلیفەی عەبباسی بووە؛ناوە بۆ پیاوان. (نام‌سردارسپاه معتصـم خلیفـە عباسـی.اسـم مردانە)
ئـەفشـین : ف. مـان. سـنوورەوان؛ نـاوە بـۆ پیاوان. (مرز دار؛ نام مردانە)
ئەفغان:[ناو] فد: خەڵکی ئەفغانستان. (افغان)
ئـەفغانسـتان: فـد: وڵـاتی ئـەفغانسـتان. (افغانستان)
ئەفغانی: [ئاوەڵناو،ناو] فد: (١) یەکەی پووڵی ئەفغانستان. (واحد پول افغانستان)(٢) خەڵکی ئەفغانستان.(مردم افغانستان)
ئەفـوایی: [ئـاوەڵناو،بـەنـد] دەمـی؛ قسـەی-ئەفواهی: وتەی خەڵک؛ وتەیێکی بێ‌بەڵگە و نەسەڵمێنراو. (افواهی)
ئەفەرۆز: [ناو](١) ئافەرۆز؛ بێحـەیـا؛ بێشـەرم. (بی حیا) (٢) وەلانراو؛ بەجێماو؛ بێبەش؛ بێ-وەری. (طرد)
ئەڤ: [جێناو]ئەو؛ ڤی؛ ئەو بـۆ نێرینـە؛ ڤـێ؛ ئەو بۆ مێ. (او)
ئەڤان: [جێناو]ئەوان. (آنها)
ئەڤ‌چەند: [بەند]هێندە؛ ئەونە؛ ئەوەندە؛ ئەڤ قاس. (آنقدر؛ اینقدر)
ئەڤدین: [ناو]تۆڵە. (تلافی)
ئەڤرا: [ئاوەڵناو]بڵیند؛ بەرز. (بلند)
ئەڤراز:[نـاو]هـەوراز؛ بڵینـدی؛ ئـەفـرا تـەپ؛ سەرەو ژووری‌کەل. (سر بالایی)
ئـــەڤـــڕاختن: [چاوگـــە،ت]پیاهـــەڵکـــوتن؛ تاریفکردن؛ بەشاخ و باڵداهاتن و خوێنـدن. (تعریف کردن)
ئەڤراندن: [چاوگە،ت]ئافڕاندن؛ دروسـتکردن؛

چێکردن؛ ئافەریدەکردن؛ خولقاندن. (آفریدن)
ئەڤرێست: [ناو]هەڤرێست؛ جۆرە دارێکە. (اسم درختیست)
ئەڤرۆ: [ئاوەڵناو،ناو،بەند] ئەورۆ؛ ئەمڕۆ؛ ئیڕۆ؛ هەڤڕۆ؛(ب)لەئەم زەمانەدا. (امروز؛ امروزه)
ئەڤڕەنگ: بەولەونە؛ بەوڕەنگە؛ بەوجۆرە. (اینطوری)
ئەڤشی: [ناو]دەورە دیواری کورتی ئاژاڵ تێکردن. (حیاط جای گوسفندان)
ئەڤشین: [چاوگە]وشکبوونی شیری ئاژاڵ. (خشک شدن شیر حیوانات.)
ئەڤقا: [بەند]ئەڤقاس؛ ئەوەندە؛ ئەونە؛ هێندە؛ هێند. (اینقدر)
ئەڤک: [ناو]میتکە؛ قیتکە. (چوچوله)
ئەڤۆر: [ناو]نێریەکێوی. (بزکوهی نر)
ئەڤە: (١) <ئەوە بەهەموو ماناییکەوە. (ئەوە هەڵگرە، هەر ئەوە بەتەنیا). (آنرا؛ او؛ آن) (٢) ئەوە بو ناڕۆی؟: ئەری بۆ ناڕۆی؟: بەس بۆ ناڕۆی؟. (دیگر؛ چرا؛پس)
ئەڤەڤە: ئەوتا؛ ئەوها. (اینست)
ئەڤەندە: [بەند،ت]ئەوەندە؛ ئەونە؛ ئەڤ چەند؛ ئەڤقاس. (آنقدر؛ اینقدر)
ئەڤهندە:[بەند،ت]ئەڤهێندە؛ئەوەندەهی. (اینقدر)
ئەڤی: [جێناو]ئەوی؛ ئەوەی. (ئەوەی وا لە دواوەوەیە؛ ئەوەی نەیخوا پەشیمان دەبێتەوە؛ ئەوی نەیخوا پەشیمانە) (کسیکه)
ئەڤێری: [بەند،جێناو]ئائێرە؛ ڤێری ئائێرانە؛ ئەئێرە. (اینجا)
ئەڤێها: ئەوەتا؛ ئەوەها. (اینجاست)

ئەڤێهانی: ئاوەتانی؛ ئەوەهای. (ایناهاش)
ئەقاقیا: [ناو]ئەقاقی؛ جۆرێک دارە. (اقاقیا)
ئەقچەم: [ناو]شەپۆل؛ پێل.(موج)
ئەقرەبا: فد: لە قوربی ئارەوییەوە هاتووە، قەوم و خێش؛ نزیکانی دەور و بەر. (اقربا)
ئەقفی: [ناو]خنجێری بچووک. (خنجر کوچک)
ئەقڵبڕکردن: [چاوگە،ت] تێگەیشتن؛ لە عەقڵ نزیک؛ ئەقڵ پی شکان . (فهمیدن)
ئەقڵپێشکان: [چاوگە،ت] سەرەندەرکردن لە کارێک؛ لێزانین؛ تێگەیشتن لەکارێک؛ کوڕە کە گەورە بووە عەقڵی بە چاکە و خراپە دەشکێت. (فهمیدن)
ئەقڵتێکچوون: [چاوگە،ت] گۆڕانی عەقڵ؛ خەرەفان؛ شێوانی هەستی تێگەیشتن. (ب) شێت بوون؛ خەرەفان؛ عەقڵ لە دەس دان. (زایل شدن عقل)
ئەقڵگەیین: [چاوگە،ت]عەقڵم نایگاتی پێم وایە درۆیە؛ تێگەیشتن؛ عەقڵ بڕکردن.(عقل رسیدن)
ئەقڵ لە چاوابوون: (ب) ڕواڵەت بین. (کنایه از ظاهر بین)
ئەقیق: [ناو]ئاقێق؛ عەقێق؛ ئاقێق. (عقیق)
ئەکبەر: عد؛ فد: ناوی پیاو. (نام مردانه)
ئەکتەر: [ناو]کۆڕی سینەماییە. ئارتیست؛ هونەرپیشەی شانۆ گەری و سینەما. (آکتور)
ئەکتیوڵ: [ناو]پۆماد؛ (جۆرێک وازلین)بۆ درگاکردنی دمەڵ(اکتیول)
ئەکلیل: [ناو]گەردێکە ڕەنگی کانزای زێڕ و زیوی بە بریقەی هەیە لەگەڵ ڕۆنی ئالیف

تێکەڵیدەکەن بۆ ڕەنگ‌کردن. (اکلیل)
ئەکلیل‌کاری: ڕەنگ‌کردن بە ئەکلیل. (اکلیل کاری)
ئەکوان: ناوی ئەکوانی‌دێو لە شانامەدا. (نام دیوافسانە)
ئەکوودەک: ئاخ و داخ بۆ لە دەس چوو. (افسوس و دریغ)
ئەکەدی: ناوی قەومێک‌لە نیژادی سامی کە٢٠٠٠ ساڵ پێش لەدایک بوونی مەسیح لە بەینی دوو چۆماندا دەژیان. (اکدی)
ئەکید: [ئاوەڵناو] عد: (١) ئەگید؛ مەزن؛ بەڕوومەت؛ گەورە و ڕیش سپی. (بزرگان قوم)
ئەگاڵ: [ناو]> عەگال؛ پەتکێکە جوان و با دراو ئارموان لەگەل چەفیە لە سەری دەبەستن. (عگال)
ئەگرنە: (١) ئێرەنا، لێرەنا. (اینجا نه)
(٢) لەگرنە: لە ئێرەن؛ لە ئەگرنە: لێرا نەن.(اینجا هستند)
ئەگرەیی: خەڵکی‌ئەگرە؛خەڵکی‌ئێرە.(اینجایی)
ئەگومر : وشەیێکی ئاوێستاییە (گەئوو،گیوو واتاگەورە؛ (بزرگ)
ئەگە: [بەند]هەگە؛ ئەگەر؛ هەرگا. (اگر)
ئەگەربۆ: [بەند،ت]ئەگەر بێتوو. (اگر بشود؛ احتمالدارد)
ئەگەرنە:[بەند،ت] فد: ئەگەرنا؛ ئەینا؛ ئەگینا؛ دەنا. (اگرنه؛ ورنه)
ئەگەر و نەگەر: (ب) کارێ کە دەرئەنجامی مەعلووم نییە. (پا در هوا)
ئەگەرێک‌هەیە: بۆی‌هەیە؛ شایەد؛ ڕێی تێدەچێ. (احتمال‌دارد)
ئەگید: [ئاوەڵناو] (١) گەورەی ئێل. (بزرگ) (٢) ئازا؛ شوجاع؛ نەبەز. (شجاع)(٣) پیاوماقوڵ؛ بە ڕوومەت. (محترم)
ئەگینە: [بەند]ئەگەرنا؛ ئەگینا؛ دەنا؛ ئەینا. (اگرنه)
ئەڵابەختەکی: عد؛ فد: [ناو] هەڵکەوت؛ شانسی؛ خۆ و بەختی؛ ڕەمەکی؛ تیرێکم-هاویشت ئەڵلابەختەکی لە ئامانج‌کەوت؛ قەزاوقۆرتەکی؛ قەزاو قوورەتی؛ ئاکۆیی. (شانسی)
ئەلاجگر:ئەلاجگرد؛ شارێکی‌کوردنشینە. (نام شهری است)
ئەڵاجووقە: [ناو]کایەی حەقلی‌مەقۆ.(الا کلنگ)
ئەلالەت: [ناو]تاقم؛ دەستە؛ کۆمەڵ. (دسته)
ئەڵاوەیسی: [ناو]مەقامێکی‌کۆنی‌کوردییە. (دستگاه الله ویسی)
ئەلبانی: [ناو]ئاڵبانی؛ ناوی وڵاتێکە نزیکی دوورگەی‌باڵەکان؛ ئەرناویت؛ ئەرنەووت؛ (آلبانی)
ئەڵبەت: عد؛ فد: [بەند] پاسەن؛ هەڵبەت؛ هەر وایە؛ بێگومان. (البته)
ئەڵبەتە: [بەند]پاسەن؛ هەڵبەت؛ هەروایە؛ هەڵبەتە؛ واسە. (البتە)
ئەڵبەکی: [ناو]مەنجەڵ؛ قازان؛ بەرۆش. (دیگ)
ئەلپەڕ: [ئاوەڵناو] ڕیاکار؛ دووڕوو؛ زەرقیباز؛ فێڵەباز؛ (ریاکار)
ئەلپەشک: [ناو]بەردی‌پاشۆر؛ بەردەپێ.

(سنگ‌پا)
ئەلحەو نارینحە: [ناو]گۆرانییێکی چەلەپاییە. (اسم آهنگی است)
ئەلف لە بێ نەکردنەوە: بە قەولی قانێع قول‌بە فول‌حاڵیبوون. (ب) بێسەواد؛ نەفام؛ هەڕ لە بڕ نەکردنەوە. (الف از ب نشناختن)
ئەلفوبێیی بڕیل: [ناو]ئەلفوبێیی تایبەتی کوێر کە پیتەکانی بەرزە و بە دەست پیاهێنان دەخوێنرێتەوە. (الفبای بریل)
ئەلفوبێیی مۆڕس: [ناو] هەریەک لە دوو دەستەعەلامەتی درێژ وکورت بۆ ناردنی پەیامی دوور بە دەنگی بۆقی درێژ و کورت؛ یان بە نوور یان شەوقی ماوەکورت و درێژ. (الفبای مورس)
•ئەلَق: [ناو]هەڵق؛ گەروو؛ قوڕگ؛ قوڕوو؛ گەڵوو. (حلق)
+ ئەڵقاوێز: (۱) ئاڵقەرێزی دەرکە؛ زریزە و زنجیری دەرکە داخستن. (زنجیر چفت در)(۲) لە سێدارەدان. (حلق آویز)
ئەلقایی: [ناو]دەروازەی گەورەی گوڵمێخی پان لێدراو. (دروازه بزرگ)
ئەڵقەبەگوێ: [ئاوەڵناو] ئاڵقەی غولامی لە گوێ؛ بەنی؛ بەندە؛(ب) حازر و ئامادە بۆ ئەنجامی هەر کارێک. (حلقه به گوش)
ئەڵقەپێکان: [چاوگە،ت]وەک پەپکەخواردنی مار؛ خۆ تێک‌ئاڵاندن؛ چەمەرەخواردن؛ پاپۆکە خواردنی مار. (چنبره کردن)
ئەڵقەدان: [چاوگە،ت]دەورەدان؛ پێچ‌خواردن بە دەور خۆدا؛ وەک پاپۆکەخواردنی مار.(حلقه شدن)
ئەڵقەدووگمە: [ناو]جێگای دووگمەداخستن؛ کونی جێگای‌دووگمە؛ قوڵفەی‌دووگمە (قۆپچە) داخستن. (جادکمه)
ئەڵقەڕێز: [ناو،ت]زنجیری داخستنی دەرکە.(چفت)
ئەڵقەڕێز و دوولایی: [ناو،ت]ئاڵقە و زنجیری داخستنی دەرکە کە دوولایی دەچێ بە ناویدا. (چفت و بست در)
ئەلقەمچی: [ناو]ئەلقەقەمچی؛ ئەنگوستیلەیێکە لەباتی نقیم ئەشرەفی یا کانزاییێک لە باری قەمچ بەسەریەوە دابەسترابێ؛ قەمچ واتا ڕیخی چکۆلە و پانی قەمچان؛ ئەل تورکییە واتا دەست، پەنجە. (نوعی انگشتر)
ئەلکای: (۱)دەلکای؛ دەچەسپای. (می چسبیدی)(۲)[ناوبەر] لکاو؛ چەسپاو؛ نووساو.(چسبیده)
ئەلکۆل: [ناو]تراوێکی ئاوربەرە کە دووجۆرە: (۱) خۆراکی، ئیتانۆل یان ئیتیلیک. (۲) غەیری خۆراکی میتانۆل، میتیلیک،کە زەکەریای ڕازی پاوێری کرد. (الکل)
ئەلکۆمێتر: [ناو]ئەلکۆل‌پێو؛ کەرەستەی ئەندازەگرتنی ڕادەی ئەلکۆل لە ئاوی هەلمەتکێندا. (الکل متر)
ئەلکۆلی: [ئاوەڵناو] (۱) هەر شت کە ئالوودە بە ئەلکۆل‌بێ؛ ئەلکۆلی. (آغشته به الکل) (۲) کەسێک کە بۆ ماوەیێکی زۆر خووی بە خواردنەوەی ئالکۆل گرتبێت. (الکلی)(۳) نۆشابەی(خواردنەوەی) ئالکۆل دار: نۆشابەی ئالکۆلی. (الکل دار)

ئەللوو: [ناو]هەڵووژە؛ ئاڵوو؛ ئاڵووچە. (آلوچە)
ئەڵمان: [ناو]دەوڵەتی ئاڵمان؛ ئاڵمانیا. (آلمان)
ئەڵمانی: [ئاوەڵناو+ ناو] (١) میللەت و زبانی ئاڵمانی. (مردم و زبان آلمانی)(٢) گرێدراو به ئاڵمانەوە. (آلمانی)
+ ئەڵماس: [ناو]کەربۆنی‌خالیس؛ ڕووژە؛ جەواهێرێکە بۆ شووشە بڕینەوە، یا لە جەواهێرسازیدا بەکار دێت. (الماس)
ئەڵماس‌نیشان: [ئاوەڵناو]دابەستراوی دەنکەگەلی ئەڵماس لە سەر شتێ بۆ جوانی. (الماس نشان)
+ ئەڵماسە: فد: [ناو]جۆرێک‌تێغەی ئامرازی جۆربەجۆر و دەمی برغووی کەربۆنداری سەخت و زۆر ڕەق و بە دەوامە کە لە بەردبڕین و ئاسنگەری و نەجاڕیدا بەکار دێت. (الماسە)
ئەڵمەدین: [ناو](١) پارچەی ئارمووش؛ قوماشی هەورێشمی. (پارچە ابریشمی)(٢) دار دەست. (چوبدست)
ئەلند: [بەند، ناو] بەرەبەیان؛ سبەی‌ساڵحان؛ سوای ساڵحان. (صبحدم)
ئەلۆ: اند؛ فد: سڵاوی تەلەفۆنی؛ هێلۆی ئینگلیزی. (الو)
ئەلۆئەلۆ: [ناو] عەلەشیش؛ بۆقلەموونە؛ بۆقلەمووتە. (بوقلمون)
ئەڵواتی: [ناو،بەرهەمی‌چاوگە] عد؛ فد: ئەلواتی؛کاری‌ئەلوات؛ هەرزەگی و عەییاشی و بەڕەڵایی و خوێریەتی و شەو گەردی و شەڵاتی. (الواتی)
ئەڵوار: فد: [ناو](١) درووی داری‌درێژی چوار پاڵوکراو. (٢) کۆتەداری‌بڕاوە بەمووری درێژ؛ ئاڵودار. (الوار)
ئەلوەدا [ناو]ماڵئاوایی؛ خوداحافیزی.(خدا حافظی)
ئەڵوەن : (١)ناوی چۆمێکە لە قەسری شیرینەوە بەرەو خانەقین دەڕوا(نام رودخانە- ایست) (٢)ناوی کێوێکە لە نزیکی هەمەدان. (کوە الوند)
ئەلە: [ناو]ئەڵۆ؛ هەڵۆ. (عقاب)
ئەلها: (١) کەڵکەڵە؛ ئارەزوو. (آرزو)(٢) ناوی‌خودا بە زمانی عیبری. (الها)
ئەلەزیز: [ناو]ئەلعەزیز؛ شارێکی‌کوردنشینی **تورکیەیە**. (نام شهری است)
ئەلەفە: [ناو]ئەشکێڵ؛ قوڵفەی‌خێوەت.(حلقە- چادر)
ئەلەک: [ناو]هێڵەک. (الک)
ئەلەگا: > ئێورگە؛ بۆسە؛ پەناگا. (پناهگاه)
ئەلەم:[ناو] عد؛ فد: عەلەم؛ دەرد و ڕەنج؛ ئازار؛ نەخۆشی؛ ئەو دەرمانە بخۆ عەلەمت (ئەلەمت) تیدا نامێنێ. (الم)
ئەلەمووت: ناوی قەڵاییێک لە نزیکی شاری قەزوێنی ئێران کە حەسەنی‌سەبباح سەرۆکی فیرقەی ئیسماعیلییەکان دروستیکرد.(الموت)
ئەڵێ: دەڵێ؛ ئەوشێ؛ دەبێژێ؛ دەبێژە؛ ماچۆ (می گوید)
ئەلیووردۆ:[ناو] شۆربای دان‌دار؛ دانوولە؛ شۆربای دانەوێڵە. (آش بنشن دار)
ئەلیف: [ناو]گیاییێکەڕۆنی ئەلیفی لێدەگیرێت و لەوێنەکێشانی ڕەنگ و ڕەوغەندا کەڵکی لێوەردەگیرێت. (الیف)

ئەلیک: [ناو]کوڵمە؛ ڕوومەت. (لپ)
ئەلیمی: [ناو]شاڵگەردن؛ ملپێچ. (شال گردن)
ئەڵیی: [بەند]ئەوشی؛ دەبێژی؛ ئێژی؛ دەڵیی؛ ماچی؛ وەکوو؛ ئەڵیی مانگە ئەونە جوانە. (گوئی)
+ ئەم: (١) [پێشگر] ئامرازی کەسی یەکەم بۆ ڕابوردووی بەردەوام؛ ئەمخوارد؛ ئەمهاڕی؛ ئەمشت؛ ئەمنووسی.(پیشوند.)(٢) بەجێگای دەم؛ ئەمخوارد: دەمخوارد؛ ئەمنووسی: دەمنووسی. (می در مضارع)
ئەمارات: عد؛ فد: کۆی ئەمارەت؛ کۆی ئەمیرنشین؛ ئەو وڵاتانە کە جێی فەرمانڕەوایی ئەمیرن. (امارات)
ئەماراو: [ناو]هەماراو؛ عەماراو؛ جێگای ئاو تێکردن و پاشەکەوتکردنی ئاو لە قەدیم دا. (انبار آب)
ئەمارداری: [ناو](١) فەن و زانستی بەڕێوە بردنی کاری ئەمبار و ئەمبارکردن. (٢) شۆلی بەڕێوەبردنی ئەمبار.(٣) کرێی عەمبارکردنی باری هاتوو لە پۆستەخانە یا گاراج کە ئەمباری دەکەن تا خاوەنەکەی بێت و بیباتەوە. (انبار داری)
ئەمارقەرسێنی: سەرحیسابی پیتەوای ئەمار بوون؛ ژماردنی کەلوپەلی عەمبار و پێک‌گرتنیان لەگەڵ دەفتەری ئەمباردا. (انبارگردانی).
ئەماری: [ناو]عەمباری؛ ئەمباری؛ (ب) شوێنێکی‌بچووک لە ماڵدا وەک خەڵوەتی؛ مەکۆی ئامرازی زیادی وکەلوپەلی ماڵ. (انباری) > ئەنباری
ئەماری ئاڵف: کایەن؛ شوێنی عەمارکردنی کاو وێنجە و سەوزاڵف. (انبار علوفه)
ئەماری دانەوێڵە: کەنوو یان شوێنی ئەمار کردنی دەغڵودان. (انبار غله)
+ ئەمان: [ناو]فرسەت؛ دەرفەت؛ مۆڵەت؛ بەڵام؛ ئەمما؛ دەخیل.(فرصت؛ اما)
ئەمان پێدان: [چاوگە،ت] پەنا بەکەسێک دان و پاراستنی لە ناهێمنی و مەترسی؛ فورسەت پێدان. (امان دادن)
ئەمان پێنەدان: [چاوگە،ت]پەنا پێنەدان ؛ دەرفەت نەدان؛ بڕست و فورسەت لێسەندن؛ بە سەردا نەچوون و لێنەبووردن؛ هەر سەری لە سەنگەر دەرکەوت ئەمانی پێنەدا تفەنگێکی تێگرت. (امان ندادن)
ئەمان‌خواستن: [چاوگە،ت](١)پەنا بە کەسێک بردن بۆ پارێزران لە ناهێمنی و شەڕو کێشەو خەتەر.(٢)داوای هەل و مەرج و فورسەت و هێمنایەتی‌کردن.
(امان خواستن)
ئەمان لێبڕین: [چاوگە،ت] تەنگ پێهەڵچنین؛ زۆر بۆ هێنان؛ هەراسان‌کردن. (امان بریدن)
ئەماننامە: فد: [ناو] نووسراوەیێکی ڕەسمی یان دەوڵەتی، برێتی‌لەوە کە گیان و ماڵی خاوەن ئەماننامە بپارێزرێت.(امان نامه)
ئەمانەتخواز: [ناو]کەسی‌کەداوای شتی‌دەکا بە ئەمانەت کە دوایی بیداتەوە. (امانت خواه)
ئەمانەتخوازی: [ناو،بەرهەمی چاوگە] کاری خواستن و داوا کردنی شتێ بۆ ماوەیێک. (امانت خواهی)

ئەمانەتدار: [ئاوەڵناو] [ناو،ت]فد: (۱) کەسێک کە ئەمانەتی پێ سپێردراوە. (۲) کەسێک کە جێی باوەڕی جەماوەرە؛ ئەمین؛ (ب) ئەمین و دروستکار.(امانت دار)
ئەمانەتداری:فد: [ناو،بەرهەمی چاوگە] دەستپاکی و چاک ڕاگرتنی ئەمانەتی خەڵک؛ ئەمینی. (امانت داری)
ئەمانەتفرۆشی: [ناو،بەرهەمی چاوگە] دووکانی فرۆشتنی کەلوپەلی خەڵک؛ (ب) دووکانی فرۆشتنی کەلوپەلی کارکردوو (کۆن). (سمساری)
ئەمانەتی: (۱)[ئاوەڵناو] ماڵی ئەمانەت؛ شتی وەرگیراو بە ئەمانەت. (۲) بۆ ماوەیێک؛ بۆکاتێک؛ بۆ ماوەیێک بە ئەمانەتی لێرە ماومەتەوە سیٔمانگیتر دەڕۆم. (امانتی)
ئەمانەتی پۆستی: [ناو،ت] شتێک کە بە پۆست دا دێت یان دەنێردرێت؛ بەستەی پۆستی. (امانت پستی)
ئەمبا: (۱)[ئاوەڵناو] هەمبا؛ هاوشان. (هم شان)(۲) دەمبا؛ لەگەڵ خۆی دەمبا. (همراه خود می برد)
ئەمبایی: [ناو]هەمبایی؛ هاوقەدی؛ هاوقەرایی؛ هەمشانی؛ هاوقەدری. (هم شانی)
ئەمبوڕ: [ناو]جۆرێک گاز بۆ گرتنی شت یان دەر کێشانی بزمار لە تەختە و شتیتر وەک گاز ئەمبوڕ؛ ئەمبوڕدەستی؛ دەمباریک. پڵاس. (انبر)
ئەمجا: [بەند]ئەمجار؛ ئەوجار. (ایندفعه)
ئەمجارە: [ناو،بەند]ئەم دەفعە؛ ئەم کەڕەتە. (اینبار)
ئەمدەس بەودەس نەزانین: (ب)کاری پەنامەکی کردن بەتەڕدەستی. (کار سری کردن)
ئەمدەس و ئەودەسکردن: خۆ خافڵاندن. (دست دست کردن)
ئەمدیو ئەودیوکردن: (۱) شانەوشانکردن لە ڕاکشانا. (غلطیدن در دراز کشیدن) (۲) سەرکێشان بۆ هەموو وەتاغ و ژوورێک. (سرک کشیدن) (۳) هاتوچۆی لە سنوور پەڕینەوە. (آمد و رفت پیاپی از مرز) (۴) کونکردن بە گوللە و دەرچوونی لە لاییێکی دیکەوە؛ ئەم دیو ئەو دیو سمین. (سوراخ شدن سرتاسری بدن با گلوله)
ئەمراز: [ناو]ئامراز؛ کەرەستە. (وسیله)
ئەمڕاز: [ناو]ئامڕاز؛ هامڕاز؛ هاوقسە؛ هاونشین؛ هەمڕاز. (همراز)
+ ئەمڕۆ: [ئاوەڵناو، بەند] ئیرۆ؛ (ب) لەم ڕۆژگارەدا؛ ئێستا؛ ئەمڕۆ چەقۆکێشی باوی نەماوە. (امروزه)
ئەمڕۆکە: [بەند]ئەوڕۆکە؛ لەو ڕۆژگارەدا؛ ئیمڕۆکە؛ ئیمڕۆ. (امروز)
ئەمرونیا: [ناو،ت]لە(ئەمرونەهی)ی فارسییەوە هاتووە، ئەمر و نەهی؛ لە ئەمرو نیای کەسێکدابوون: لە ژێر فەرمان و گوێڕادێری کەسێکدابوون. (تحت امر)
ئەمڕۆ و سبەی: [بەند](۱) (ب) لەم ڕۆژانە دا؛ بەم زووانە؛ ئەمڕۆ و سبەی دێتەوە.(۲) ئەمڕۆ تا سبەی؛ دەستاودەست پێکردن؛ ماتڵکردن.(امروز و فردا)
ئەمڕۆ و سبەی پێکردن: خافڵاندن و

دواخستنی کارێک. (امروز و فردا)
ئەمڕۆیی: [ئاوەڵناو]ئیمڕۆژی؛ مـۆدیئـەمـڕۆ؛ بابەتی ئەمڕۆ؛ پێوەندیـدار بـەکـاتی ئێسـتاوە. (امروزی)
ئـەمـری‌خێـر: کـاری‌خێـر؛ (ب) هـاو سـەر مـارەکـردن؛ زەمـاوەنـدی ژن‌هێنـان و شووکردن. (امر خیر)
ئەمریکا:ئامریکا: ناوی قوڕنەی ئەمریکا لـە - نـاوی (ئامـەریکـۆ ویٚسـپۆچی) هـاوڵێکی کریستۆف‌کلۆمب وەرگیراوە لـەو کاتـەدا کـە قوڕنەی ئەمریکایان پاوێر کرد و ناویان لێنـا. (قاره آمریکا)
ئەمسا: [بەند]ئیسە؛ ئێسا؛ ئێسە؛ ئێستە. (حالا)
ئەم شـاخ و ئـەو شـاخ‌کـردن: (ب) قسـەی دژبەیەک‌کردن؛ قسـەگـۆڕین؛ ڕاڕا بـوون. (از این شاخه به آن شاخه پریدن)
ئەمشاسپەنـد: نـاوی هـەریـەک لـەحـەوت فریشتەکانی دینی زەڕدەشت کە هەر کام بەر پرس یان ڕاسپاردەی بە ڕێوەبردنی کـارێکن بە ئیرادەی ئاهورا مەزدا. (امشاسپند)
ئەمشەوانە: [بەند،ناو،ت]ئـەم چـەنـد شـەوە. (این شبها)
ئـەمشـەوگـین: [ئـاوەڵنـاو] هـی‌ئیمشـەو؛ ئەمشەوین؛ پێوەندیدار بە ئەمشەووەوە؛ شـامی ئەمشەو گین: شامی ئەمشەو. (امشبی)
ئەملا: [جێناو]دژی ئەولا؛ لای نزیکتر؛ لایە- نی نزیکتر. اینطرف)
ئەملا و ئەولا: [جێناو](١) شانە و شان؛ بـەم- لاو ئەولادا خۆی دە لەنگێنێ. (٢) لای ئـەم وئەو چوون بۆئەنجامی کارێک. (٣) جێگـای
جۆراوجۆر؛ لەم لا و ئەولا باسی چاکـەی تـۆ دەکەن. (این ور و آنور)
ئەملک: [ناو]بەرخی ساوا. (نوزاد بره)
ئەملکن: [ناو]بەرخێک کە تەمـەنـی لـە دوو مانگ کەمتربێ. (بره تا دو ماهه)
ئەمماتێخستن: [چاوگە،ت] ئەگـەرتێخسـتن؛ (ب)بەهانە هێنانەوە؛ بڕوو بیانوو تاشین. (اما و اگر)
ئەمن‌وئەمان: [ئاوەڵناو] فـد: ئـارام و دوور لـە ترس و خـۆف و ئـاژاوە و شـەڕوشـۆڕ؛ لـە- هێمنایەتیدا. (امن و امان)
ئەمنە: (١)[بەند] ئەمەنە؛ ئەمەندە؛ ئـەوەنـدە؛ هێندە. (٢) ئارامە؛ هێمنە. (اینقدر؛ آرم است)
ئـەمنـەسـوورەکـە: [نـاو] ڕێخـراوی (ئیستیخبارات) و زیندان و شوینی ئـەشـکە- نجەی سەربە ڕێژیمی ملهوڕی بەعس بوو لە شاری سلێمانی کە لە سەرە تای شۆڕشدا بـۆ گرتنی ئەو شوێنە خوێنی لاوانی کـورد عـە- رزی سوورکرد. (سازمان امنیت رژیـم صـدام درشهر سلیمانیه)
ئەمنیە: [ناو]ژاندارمەی قەدیم. (امنیه)
ئەموئەو: ئیشارە بە خەڵکـی نادیـار؛ تـەواوی ماڵەکەت دا بە ئەم و ئەو. (این و آن)
ئەمووس: [ناو]ئەنگوس؛ قامک؛ تبل؛ کلـک. (انگشت)
ئەمووستیلە: [نـاو]ئـەنگوسـتیلە؛ کلکـەوانـە. (انگشتر)
ئەمهاری: زبانی زۆربەی خەڵکی ئێتیۆپی کـە لە ڕەچەڵەکی زبانگەلی سامییە. (امهاری)
ئەمەچەو: ئەمە چی‌بـوو؛ ئـەوشـتە چـی‌بـوو؛

ئەمەچەو هەموو ڕۆژێک دێیت. (این چیه)
ئەمەهای: ئەمەتا؛ ئەمە لێرەیە.(اینست)
ئـەمـەکـحـەرام: [ئـاوەڵنـاو] (ب)بێـوەفـا؛ بێناخوون؛ سپڵە. (بیوفا)
ئەمیـان: (١)[جێنـاو]ئـەمـەیـان.(ایـن‌یکـی) (٢)[نـاو]کیسـەی پـوول؛ هـەمیـان؛ هـەـ-مانە.(کیسه چرمی)
ئەمیـر:[نـاو] عـد؛ فـد: (١) پلـەی لـە سـەر هەنگی بەرەو ژوورتر لە ئەرتەشدا(لە سوپای ئێراندا).(٢) ناوە بـۆ پیـاوان. (٣) سـەرکـردە. (امیر)
ئەمیرزادە: [ناو] عد. فد. کوڕی‌ئەمیر؛ لە بنـەـ-ماڵەی ئەمیر. (امیرزاده)
ئەمیرە: عـد؛ فـد: لـەقـەبـی ژنێـک کـە لـە بنەماڵەی پاشا و ئەمیربووە. (امیره)
+ ئەمین: [ناو] [ئاوەڵنـاو] (١) هـەریـەک لـە ئەندامانی کوڕی ئومەنا. (امنا)(٢) کەسێک‌کە دادگا هەڵیـدەبژێرێـت بـۆ ئاگـالێبوونی مـاڵی هەتیو یا کەسێکی تر کە پێویستی بە ئەمـین هەیە. (امین) (٣) ناوە بۆ پیاوان. (نام مردانه)
ئەمـین‌بـوون: [چاوگـە،ت](١) ئـەرخـەیـان؛ ئەرخایەن؛ لەو شوێنە ئەمین نـیم: متمانـەی پێناکەم: جێگای مەترسیە. (امین بـودن) (٢) جێی باوەڕ بوون؛ دەست و چـاو پـاکـبـوون؛ دەست و چاو پاکی. (امین بودن)
ئەمیندار: [ئـاوەڵنـاوی‌بـک+نـاوی‌بـک] فـد: کارگێڕ و سەرکاری ئاغا بۆ بەڕێوەبردنی‌کار و خـەرمـان هـەڵگـرتن؛ دەستوچاوپـاک و جێگای‌متمانە.(امین دار)
ئەمینداری:[ناوبەرهـەمـی‌چاوگـە] فـد: (١) دەست و چاو پاکی؛ (٢) کاری ئەمینـدار. (٣) شۆلی سەرکاری و خـەرمـان هـەڵگـرتن لـە گونددا. (امینداری)
ئەمینکردنەوە:[چاوگـە،ت]تـرس ڕەواندنـەوە، بڕۆن ئەو دزانە ئەمین‌کەنەوە: ((ئـارام کردنـە وە، ئەرخایەنیان‌کەن)؛ گرتنـەوەی بـارگینی بەڕەڵا بوو. (مطمئن کردن؛ آرامکردن)
ئەن: [بەند]چەندە؛ چەنـد؛ هـەنـدێ؛ هێنـد؛ (چقدر)
ئەناب: [ناو]شیلە ؛ ددانی پێشەوەی ڕەشەوڵاخ ئەگەر پکەوێت نیشانەی ئەوەیە تەمەنـی لـە چوار ساڵ بەرەو ژوورە. (دندان جوانی گاو)
+ ئەنـاز: (١) پاشـگر: تـووڕدەر؛ هـاوێژ؛ تیـر ئـەنـداز: تیرئـەنـاز، فڕێـدەر. (٢) پاشـگر: پانکـەرەوە؛ ڕاخـەر؛ داخـەر؛ پانکردنـەوەی فەرش و ڕاختنی بۆ پای ئەنداز؛ پا
ئەنداز: پایەناز. (انداز)
ئەناشتا:[ناو](١) سبەینـان پـێش بـەر قلیـان خواردن؛ لـە خـورێنی. (ناشـتا) (٢) ناشـتایی؛ چاشت؛ خواردنی‌بەیانی؛ سبحانە؛ بەر قلیـان. (ناشتایی)
ئەنام گیان:[ناو]ئازای پێکهێنەری‌لەش؛ ئازای ئەنام؛ ئازای ئەندام.(اعضای‌بدن)
ئەنبـارداری: [نـاو]عـەمـارداری: (١)پیشـەی ئاگاداری‌لە هەمار و سەرحیسابی شتی هەمار کراو بوون. (٢) کرێی ڕاگرتنی هەر شت کـە لە هەمارا ڕاگیرێ. (٣) زانستی هەمار کـردن و بە ڕێوەبردنی کاری هەمار.(انبار داری)
ئەنبارکردن: [چاوگە،ت]عەمارکردن: دانان لە ئەنباردا .(لە ڕوانگەی زانستیەوە: کۆکردنـەوە

و هـەڵچنـین و ڕاگـرتن و پاراسـتنی هـە-
ركاڵاییێک لە هەمارا. (انبار كردن)
ئـەنبـاری: [نـاو+ئـاوەڵنـاو] (١) عـەمبـاری؛
وەتاغێکی بچووک بۆ دانانی کـەلوپـەل لـە
ماڵدا؛ هەماری. (انباری) (٢) هەر شت ڕاگیراو
لە هەماردا؛ هەر میوە یان خواردە مەنـی کـە
شیاوی هەمارکردن بێت؛ پیـازی هـەمـاری؛
پێرەلماسی ئەنباری. (انباری)
ئەنباریئارد: کەنـوو؛ شـوێنی عـەمبـارکردنی
ئارد. (انبار آرد)
ئەنبان: [ناو]هەمبانە؛ هەمانە؛ هەوانە؛ هەڤانە؛
هەوان؛ هومبان؛ هەڤان؛ هەنبانە؛ کیسـە لـە
پێستی خۆشکراوی وردە حەیوان. (همیان)
ئـەنبـوڕ: [نـاو] مقـاش؛ ئـەمبـوڕ؛ پوولـووگر؛
ئـامرازی دوو شـاخەی کـانزایی بـۆ گرتنـی
سکلْ و پوولووی ئاور. (انبر)
ئەنبوڕدەستی: [ناو] پڵاس؛جۆرێک گـازی دەم
پانە؛ بۆ بزمار دەرهێنان و قرتاندنی سـیم؛ لـە
کاری سیمکێشیکارەبادا لـە نـەوعێکـی کـە
دەسکەکەی ڕووکێشی لاسـتیکییە کـەڵـک
وەردەگرن. (انبردست)
ئە نبۆژە نی: [ئـاوەڵنـاو]ماددی؛سـەربـەمـاک؛
(دژی پژۆنی). (مادی)
ئەنبە[ناو] هێندد؛ فـد: عـەمبـە؛ (١) دارێکـە
هەمیشە سەوز لە شوێنی گەرمدا دەڕوێ؛ (٢)
میوەی ئەو دارە. (انبه)
ئەنتاری: [ناو]کەوا. (لباس بالا تنه)
ئەنتوپەهەت: [ناوبـەر]گومـان لێکـراو؛ جێـی
شک. (جای شک و شبهه)
ئەنتەر: [نـاو]عـەنتـەر؛ جۆرێـک مـەیمـوون.
(عنتر)
ئـەنجـامبـوون: [چاوگـە،ت]بـەگائامـەی؛
جێبەجێبوون؛ تەواوبوونیکـار؛ هاتنـەکـرن.
(انجام شدن)
ئـەنجـامدان: [چاوگـە،ت] جێبـەجـێکـردن؛
پێکهێنان؛ پێکـئانین؛ تەواوکردنیکار؛ بـەگـا
ئاردەی؛ قەداندن. (انجام شدن)
ئەنجوجە: [ناو] ئەنجووجەک؛ ناوکی هەرمـێ
بە برژاوی، کـە دەیتـروکێنن. (تخـم گلابـی
بودادە)
ئەنجومـەنئـارا: [ئـاوەڵنـاو] مـەجلـیسئـارا؛
کەسێککە کۆڕ و مەجلـیس دەڕازێنێتـەوە و
گەرمیدەکا.(مجلس آرا)
ئەنجومـەنـی ئـەدەبـی: کـۆڕی شـاعیران و
نووسـەران و وێـژە وانـان. (انجمـن ادبـی)
ئەنجومەنی بەڕێوەبەری: لێژنەی هەڵسـووڕ-
اندن و کار ڕاپەڕاندن. (انجمن اداره کردن)
ئەنجومەنیشار:کـۆڕی شـوڕایشـار و بـەر-
پرسانی شارەداری: شارەوانی. (انجمن شهر)
ئەنجومەنیلادێ: کۆڕی ئەنـدامانی شـوڕای
گوند. (انجمن دە)
ئەنجومەنی ماڵو مەدرەسـە: کـۆڕ لـەگـەڵ
بـەرپرسـانی مـەدرەسـەدا. (انجمـن گرتنـی
دایکوبابی منداڵە مەدرەسە خانە و مدرسە)
ئەنجە ئەنجە: ئەنجن ئەنجن؛ لەت
لەت؛ کوت کوت. (تکە تکە)
ئەنجیر: [ناو]هەنجیر. (انجیر)
ئەنجیر باوا: [ناو]مەوز. (موز)
ئەنداز: [پاشگر] (١)تووڕدەر؛ هـاوێژ؛ فڕێـدەر؛
(٢) ڕاخەر؛ داخەر؛ پانکەرەوە،

وەک: پائەنداز. (پسوند)
+ئەندازە: [ناو]ئەنازە؛ قاس؛ هێند؛ ڕادە؛ میزان؛ حەد؛ قەد؛ قەرا؛ پڕبەپڕ؛ نەزیاد نەکەم؛ نەشل نەتوند. (اندازە)
ئەندازەبوون: [چاوگە،ت]کەوشەکانی من ئەندازەیپای‌تۆن؛ بە قەدبوون؛ پڕبەپڕبوون؛ بەقەرابوون. (اندازە بودن)
ئەندازە ڕاگرتن: [چاوگە،ت] (ب) زیادە ڕەوی نەکردن؛ ڕادە ڕاگرتن؛ لە حەد نە چوونە دەر. (اندازە نگهداشتن)
ئەندازەکردن: تاقی کردنەوەی جل و بەرگ وکەوش بۆ ئەندازەبوون؛ سەر ڕاستکردنی زۆر و کەمی؛ ئەندازەگرتن. (پرو؛اندازە کردن)
ئەندازەگر:[ناوی‌بک] فد:کەسێک کە شتێک دەپێوێت و سەنگینی(کێش) یان درێژایی و پانایی دیاری دەکات یان بە قەد دەگرێت یا پێک دەگرێت. (اندازە گیر)
ئەندازەگرتن: [چاوگە،ت]بەقەدگرتن؛ بەراوەردی شتێک لەگەڵ شتێکی‌تردا؛ پێکگرتن؛ پێوان و کێشان و گەزکردن. (اندازە گرفتن)
ئەندۆک: [ناو]داری بەینی دوو لۆلەپ؛ ناو دۆک؛ نێرەژن؛ داری نێو مەشکە؛ داردۆژەنگ. (چوب زبانە دار بالای مشک)
ئە ندونێزیایی: [ئاوەڵناو+ ناو] (۱) خەڵکی ئەنۆنێزی. (مردم اندونزی) زبانیان (زبان آنها)
ئەندەر:لەناو؛ ژناقدا؛ هۆندۆر؛ جەدئەندەر جەد: پشتا و پشت. (اندر)
+ئەندەروون:[ناو] فد: ناخی هەر شت؛ناو.(اندرون)
ئەندەروونی: [ناو]ئەندەروون؛ هۆندۆر؛ ژووری ماڵەوە؛ خانووی تایبەت بۆ خێزانی ماڵ؛ دژی بیروونی. (اندرونی)
ئەندەک: [بەند] فد:(ف.مشە).هەنەک؛ هێندیک؛ هەندەک؛ تۆزێ؛ کەمێ؛نەختێ. (اندک. کم)
ئەندەکۆ: [ناو]وێنجە. (یونجە)
ئنڕاندن: [لە چاوگەی ئەنڕین) تووڕەکردن و قەڵس‌کردن. (عصبانی کردن)
ئەنڕۆک: [ئاوەڵناو]جنگز؛ تووڕە؛ قەڵس.(عصبانی)
ئەنڕیشە: [ناو]هەندرێشە؛ جۆرێک گیایە.(نوعی‌گیاە)
ئەنڕین: [چاوگە]تووڕە و زوێربوون. (عصبانی شدن)
ئەنزەلۆک: [ناو]کولبە؛ کۆخت؛ کۆخ؛ خانوچکەی خراپ. (کلبە)
ئەنفیە:[ناو] فد: تێکەڵاوێک لە ئەجزا و هەندێ گیا بۆ هەڵمژین و سەرخۆش بوون؛ بڕنووتی؛ لە تورکییەوە هاتووە؛ بڕنی‌ئەوتی واتا گیای لووت: گیای هەڵمژین. (انفیە)
ئەنفیەدان: [ناو]قوتوو یان کیسەی ئەنفیە تێکردن. (انفیە دان)
ئەنگ: [ناو]ڕووپەڕێکی نووسراو کە نووسراوەکەی کون‌کرابێ، و دروشم و نیشانەی فابریکای لە سەرجەبعە(جەعبە) و تەلیسی‌کاڵا پێ دەنەخشێنن. (انگ)
ئەنگاو: [ناو]هەنگاو. (قدم)
ئەنگر: [ئاوەڵناو] سڵ؛ تووڕە؛ قوشقی؛ زیز؛ تۆراو. (عصبانی)

دوومۆهر : [ناو] دوومۆر؛ ئەسپی ئامورکێش؛ ئە-
سپی شێوبڕین . (رسب شخم زنی)
دوون : [ئاوەڵناو] پەست؛ بێبایەخ . (دون)
دوونادوون : [ناو] ڕەوتی جێگۆڕکێی ڕۆح لە
قاڵبێکەوە بۆ قاڵبێکیتر؛ لەلایەن کەسانێکەوە
کە بڕوایان بەو مەبەستە هەیە. (تناسخ روح)
دوونادوون : هەندێک ڕایان وایە کە هەمان
(توونادتوونە) واتا لە چەقەرەیەکەوە بۆ چەقەرە-
یێکی دیکەی‌جەهەندەم . (از جهنمی به جهنمی
دیگر)
دوونیکڵ :[ئاوەڵناو] دووپۆپە؛ فڕندەی دووکڵاوە.
(دو تاج)
دووهۆنی : [ناو] دووڕوویی؛ دووڕەنگی.(دورویی)
دووێنەر : [ناوبک]کەسێک کە وەقسە دێنێ.
(به حرف آورنده)
دوێ : [ناو+ بەند] دوێنێ؛ دوێکە.(دیروز)
دویچە : [ناو] گلۆڵە بەن.(گلوله ریسمان)
دەب : [ناو] ئابڕوو؛ ڕوومەت؛ حورمەت. (آبرو)
دەبا : جێگای دەبێتەوە؛ وەک: ئەم کیسە
دووکیلۆ دەبا . (جامیشود. ظرفیت)+
دەباراندابوون : لەتوانادابوون؛ لە دەستهاتن.
(توانائی‌داشتن)
دەبرە : [ناو] مووچە؛ مزی قەرەواش و نۆکەر و
ژێردەستان؛ بەرات. (حقوق ؛ دستمزد)
دەبوو : ئەشیا؛ دەشیا؛ دەبووا؛ مەشیا . (میبود)
دەبە : [ناو] بەرمیل؛ بۆشکەی چووک؛ دەببە .
(دبه)+
دەبە : جوانەگای نەخەساوی مل‌ئەستوور و شە-
ڕانی. (گاوگردن کلفت)+
دەبەرنیشتن : [چاوگە،ت] خۆ دانەبەرکارێک؛
دەستپێکردنی‌کارێک.لەبەر نیشتن. (مشغول به-
کاری‌شدن)
دەبەرنیشتن : [چاوگە،ت] چوونەبەر کۆشی ژن
بۆ کاری سەرجێیی. (بردامن زن نشستن)
دەبەگولوو : [ناو،ت] کۆمکردنی هەر شتی
دیاری کراو تا دەجار و هەرجار دوو بەرانبەر دە-
بێتەوە، وەک ۱۶/۸/۴/۲ واتا ۱۰۲۴ بەرانبەر
(تصاعد هندسی تا ده بار)
دەبیر : [ناو] سەیدا و سیت کە لە دەبیرستاندا
وانە (دەرس) دەڵێنەوە؛ ڕازنووس؛ نووسەر.
(دبیر)
دەپودۆغر :[بەند] (دوغر تورکییە: ڕاست)قسەی
ڕاست‌وڕەوان؛ قسەی ڕاستەوخۆ و بێ‌ڕوو بینی.
(رک وراست)
دەجاڵ :[ئاوەڵناو](ب)درۆزن.(دروغگو) <جەجاڵ
دەخشتە : [ناو] دەشتان؛ مەهان؛ بێنوێژی.
(قاعدگی)
دەخڵ : داهات؛ ماف؛ پێوەندی؛ دەخڵی بە منە-
وە نییە: پێوندی بەمنەوە نییە. (ارتباط)+
دەراغ : [ناو] جێگەی چنینی فیشەکی دەمانجە
و تفەنگ کە دەخرێتە خەزانە؛ جێی فیلم کە لە
گەڵ فیلمەکەدا دەخرێتە ناو کامێرا . (خشاب)
دەرانە : [ناو] درانە؛ دەرک؛ دەرگا؛ دەرکە.
(درب)
دەراوردن: [چاوگە،ت] دەرهاوردن؛ دەرهێنان
(درآوردن)
دەربەس :[ناو] دەربەست؛ ترس؛واهیمە؛دەربەس
نیم: ترسم نییە ؛ ڕەنگە هەر بەمانای ئەوەبێت
دەروەس نیم: بەرپرس نیم یا وەبەرخوم نەگرتوە
و زامن نیم . (ترس یا تعهد)+

دەربەند: [ناو+ ] گەلی؛ کووچەی بن بەستراو؛ کۆلانا بن گرتی. (درە؛ بن بست)
دەرپ : [ناو،] تەور . (تبر)
دەردان : سەرهەڵدانی زیپکە و هاوڵە. (سربیرون آوردن)+
دەرد دامرکان : [چاوگە،ت] ئێش و ئازار نەمان؛ داسەکنینی ئێش و ئازار. (درد آرام شدن)
دەردمردە : گیاندارێک کە لەبەر لاوازی و نەخۆشی مردبێت. (ازمریضی‌مردن)
دەردەستکردن : [چاوگە،ت] ئامادەکردن. (آمادە کردن)
دەردیبێدەرمان :[ناو،ت] دەردی کوشندە؛ دەردی کاری. (درد لاعلاج)
دەرزی سنجاخ [ناو،ت]:دەرزی عورووسی؛ دەرزیلەی قاییمکردنی قوماش و بەریەخە.(سنجاق قفلی)
دەرزیقاقەز : [ناو،ت] جۆرێک دەرزی کەسەرەکەی گۆپکەیەکی خڕە و بۆ لکاندنی چەند بەرگ (لاپەڕە)قاقەز کەڵکی لێ وەردەگرن.(سنجاق کاغذ)
دەرزیگیا : [ناو،ت] دڕەیلێ؛ واتای ناوەکەی بە ئینگلیسی و ئارەوی و فارسی گیای شەکەرمەزە. (علف مرض قند)
دەرزیلێدان : [چاوگە،ت] (١)بە دەرزیلە شتێ بەستن. (سنجاق زدن) (٢)بە شرینقە دەرمان کردنە نێولەش.(آمپول زدن)
دەرساخ : [ناو،] دەستاخ.تد: دەستاق؛ دۆساخ؛ زیندان. (زندان)
دەرکزە : [ناو]کاڵاییێک کە ڕەوانەی دەرەوەی وڵات دەکرێت؛ دژی بەرکزە. (صادرات)
دەرمانەئازار : [ناو،ت] گوڵەدەوری؛ گیاییێکە لە سەقز و سەردەشت و هەورامان زۆرە بۆ کوڵنج بەکەڵکە. (آقرقرحا)
دەرمانەحەفوو : [ناو،ت] دڕکەبووڵینە دڕکەکەوە؛ دڕووەشینە؛ وردکراوی ساقەت وگەڵاکەی لە گەڵ سرکەدا بۆ برین و جێی چزوی دووپشک و مار بەکەڵکە . (خارنقرهای)
دەرمانەدیان : [ناو،ت] گیای کەفێنە . (گیاه صابونی؛ غاسول)
دەرمانەگمێز : [ناو،ت] گیاییێکە دژی دەڵەمێزییە لە سەقز و مهاباد و شنۆ و بۆکان زۆرە . (سنبل-ختایی)
دەرمانەگوێ: [ناو،ت]گیای مارمێ لە خۆراوای-کوردستان و جوانرۆ و کەرکووک زۆرە، دارچێویشی پێدەڵێن بۆ کوشتنی هوورگی ناوگوێ بەکەڵکە .(گل مریم)
دەرمانیڕەوانی : (١) دەرمانی ئیسهاڵ و زکچوون. (مسهل)
دەرنشێڤ : [ئاوەڵناو] بەراوەژوو؛ سەرەونخوون. (برعکس)
دەروازە : [ناو،] دەرکی گەورە؛ دوو ڕێژەکی بە-تۆڕچنراوی گورەپانی تۆپێپێ. (دروازە فوتبال)+
دەروونداز : [ئاوەڵناو] بەجەرگ؛ دڵدار؛ دڵگوشاد؛ جوامێر؛ دڵفراوان. (با همت؛ جگردار )
دەروونی :[ئاوەڵناو] هۆندۆری؛ ناخی؛ گیانی. (درونی)
دەرووچ : [ناو،] پەنجێرە.(پنجرە)
دەرەتان : هەل و دەرفەت؛ جێگەی ڕزگاربوون. (مفر)
دەرەجەیک : بنزاراوەی ئەردەڵانی>دەرەجە

یێک.
دەرەجەیەک : [ئاوەڵناو] هەنارەکە دەرەجە یەکە واتا: زۆر چاکە؛ سەرە. (درجەیک؛ ممتاز)
دەرەجەیێک : پلەیێک؛ یەکپلە؛ دەرەجەیێک سۆباکە زیاد بکە، واتا: یەکپلە، یەکدەرەجە زیادی بکە.(یکدرجە).
تێبینی:هەر ئەو ناوچە(موکوریان)کە یێک بە یەک گۆیە دەکا هێندی جار بەراوەژوویان دەکاتەوە و (دانەدەم یەکبە دانەدەمیێک) بەکاردینێ کە لێرەدا (یەک و یێک) هەر واتاییێکیان هەیە وکێشەی بنەمایی زمانی کوردی نییە ئەکەرچی چاوەڕوانی یەکلایی بوونی هەیین
دەرەدزە : خۆدزینەوە لەکار. (از زیرکار دررفتن)
دەرەندەشت : [ئاوەڵناو]کاکیبەکاکی؛ زۆر بەرفراوان.(درندشت)
دەرەنگ : درەنگ؛ دێر. (دیر)
دەرەوکەفتن : [چاوگە،ت]چوونەدەر؛ وەدەرکەوتن؛ ئاشکرا بوون. ( بیرون رفتن؛ برملاشدن)
دەری : [ناو،] زمانی فارسیی دەری. (فارسی دری)
دەریابڕە : [ناو،ت] ماسیخۆرە؛ فڕندەیەکی مەلەوان و گەورەیە، دووجۆرن: ڕەش و گەردن-سوور. (مرغغواص)
دەریادڵ : [ئاوەڵناو] دڵفرە؛ دڵفرەوان؛ دڵئاوا. (دریادل)
دەریاگیربوون : حاڵەتی نەخۆشینی زۆر مانەوە لە کەشتی و دەریادا. (دریاگرفتگی)
دەریاوانی : هەڵسووڕاندنی کاروباری کەشتی و پاپۆڕ. (ناخدائی)
دەریزانک :[ناو] کەوشکەن؛ ئاستانە؛ پێشدرگا.
(کفش کن)
دەریناهێنێ : (١)نای هێنێتە دەرەوە. (بیرون نمی آورد) (٢ب). پێکنایێ؛ وانابێت؛ تەواوی ناکا؛ سە رناگرێ. (نمی شود) (٣)بەشناکا؛ ناگا.(نمیرسد)
دەزگبادریاگ : [ناو،بەر] فرێتیکرژ؛ دەزووی بادراو؛ کشتەک. (ریسمان تاب دادە)
دەزگهەڵکەر: [ناو،ت] خەڕەک؛ کڵافەکەر و کۆکەرەوەی دەزوو. (چرخ ریسمان)
دەزگیاو :[ناو،ت] دەزوویێک کە دۆعای بە سەردا دەخوێنن بۆ چاکبوونی نۆبەتێ؛ دەزووی لەرزبڕین. (ریسمان دعای قطعتب)
دەزگین : [ناو،] (١)دەزگیرە.(دستگیرە). (٢) هەوسار؛ هەفسار؛ دەسکەوسار؛ دەستەجڵەو. (افسار)
دەزویران : [ناو،] دەزگیران. (نامزد)
دەزیران : [ناو،] دەزگیران. (نامزد)
دەژاندن : [چاوگە،ت] داخکردنی ددان بۆ ژان شکاندنی. (داخکردن دندانی کەدردکند)
دەسئایر : [ناو،ت] ئاوردوو؛ دەسەچیلە. (شاخە های نازک آتشروشن کردن)
دەسایەر : [ناو،ت] ئاوردوو؛ دەستە چیلە. (خاربرای روشنکردنآتش)
دەسبار : دووکەسی، دەست بەیەکەوە گرتن و تایێک بارکردن . (دو نفر باری بار کردن)
دەسباز : [ناو،ت] دەستەواژەی مۆسیقایە، واتا دەنگی سیمی ساز لە حاڵەتی ئازاددا. (دستباز)
دەسبژیر : [ناو+ ئاوەڵناو]دەستچین؛ بەدەست هەڵبژێردراو؛ هەڵبژاردە. (دستچین)
دەسبۆ : [ناو،] شەمامە . (دستبنو)
دەسبەدەسدان : (ب) دەست نانە ناودەستی یە-

ک؛ بەیەک گەیاندنی بووک و زاوا. (دست به دست دان)+
دەس‌بەزەرەر : زەرەرگەیێن؛ کەسێک زۆر خەتا بکا و زەرەر بگەیەنیٚ. (زیان رسان)
دەس بەکاربوون : [چاوگە،ت] دەسپێکردن . (شروع کردن)
دەس بێنک : [ناو،ت] دەستبەند؛ بازنە؛ خرخال. (النگو)
دەستاڤێتن : [چاوگە،ت] دەستاوێژتن؛ گرتن؛ دەست بۆ بردن. (دست‌درازی.دست‌اندازی)
دەستاو : [ناو،ت] تاماو؛ ئاودانی مەڕومالات بە ئاویٚ کە (دۆ و سزگاو)ی تێکەڵ دەکەن . (آب-دادن حیوانات باآب و دوغ مخلوط)+
دەستباز : فد: [ناو،ت]کۆژی مۆسیقاییە؛ میزراب لە سیمی‌ئامێرێکی مۆسیقادان بی‌ئەوەی قامک لە سەر سیم دابنرێت.(دستباز)<دەسباز
دەستبڕ :[ئاوەڵناو] دەسبڕ؛ قۆلبڕ؛فێڵەباز؛ هەڵخەڵەتێن؛ خاپێن. (کلاە بردار)
دەستبەربوون : [چاوگە،ت] (ب) جیا بوونەوە؛ لەیەک هەڵبڕان؛ دوورکەوتنەوە؛ دەست بەربوون لە شتیٚ‌کە بەدەستەوە بێت. (جدا شدن)
دەستبەستی : [ئاوەڵناو] دەستبەستراو؛ چ ژیٚ-نەهاتی. (دست‌بسته)
دەست بەسەرداگرتن: [چاوگە،ت] ئاگالێبوون؛ خودانکرن؛ دەستی بەسەر منداڵی هەتیوودا گرتووە . (مواظبت کردن)(ف.هن)زەوتکردن.(غصب کردن)+
دەستبەسەری : [ناو] هەڵداشتن و دوورخستنەوە لە زێد بە ویستی حکومەت و لە ژێر چاوەدێریدا بوون.(تبعید)
دەست بەلاف : [ئاوەڵناو] هەڵەخەرج؛ دەست بلاٚو. (ولخرج)
دەستبەند : [ناو] (۱) کەلەپچە. (دستبندزندانی). (۲) بازن؛ خرخالٚ؛ مووچ‌بند. (دستبند)+
دەستبێن : [ناو، دەزبێن؛ ڕێسمانێک کە شەوانە شوان دەیکاتە مل شەکێکی سرک و سەرێکی تری دەکاتە باسکی خۆی بۆ ئاگاداری لە مەترسی یان ڕادانی ڕانەمەڕ. (ریسمان‌بازوی-چوپان)
دەستپێک:سەرەتای دەستکردن بە-کارێک.(شروع)
دەستتێکەڵکردن : [چاوگە،ت] (ب) سەرجێیی کردن و پێکەوە نووستنی ژن و پیاو. (همخوابگی)
دەستتێهەڵکێشان : [چاوگە،ت] دەستکردن بە ناوتراو یان شتی‌تردا؛ دەستکردن بە ناو قوڵی کراسدا. (دست فروبردن)
دەستجەم : [بەند] تەڤرا؛ تێکرا؛ گشت؛ پێکەوە. (دسته جمعی)
دەستچێکری :[ئاوەڵناو]کاری دەست؛ دەستکرد. هەر شتێک کە بەدەست دروستکرابێت . (دستکرد)
دەستخاڵی : [ناو+ ئاوەڵناو]دەست بەتالٚ؛ (ب) فەقیر؛ بی‌ئەنوا؛ هەژار؛ دەستەنگ؛ نەدار. (بینوا)
دەستخاو : [ئاوەڵناو] دەستخاڤ؛ سست لە کاردا . (سست درکار)
دەستخڕۆ : [ناو] (۱)دەستخەڕۆ؛ فریو؛ خاپان؛ خەڵەتان؛ (فریب)(۲)دەستەمۆ؛ ڕام ؛ هۆگر؛ (رام)
دەستخۆر : چێشتیٚ‌کەبە دەست بخورێت و تراو نەبێت. (خوراک غیر آبکی)

دەستخۆش : ئافەرین‌کردن لە چاک ئەنجامدانی کارێک. (تشکر)
دەستخوێندنەوە : [چاوگە،ت] بەراوەردکردنی دەستی حەریف لە یاری پەرانتۆدا؛ (ب) هە ست کردن بە نییەتی کەسێک. (دست خواندن)
دەستخەڕۆ : [ناو، (١)فریو؛ (فریب).(٢)دەستەمۆ؛ ڕام؛ کەوی. (رام)> دەست خڕۆ
دەستخەڕۆکردن : [چاوگە،ت] خاپاندن؛ ڕامکر-دن. (فریفتن)
دەستخەلیای : دەست لە جێ‌چوون.( ازجا-دررفتن دست)
دەستدروو : [ئاوەڵناو] شتێکە بە دەست دروابێت، (دوورابێت) . (دست دوز)
دەستدرێژ: [ئاوەڵناو (ب)دەستڕۆیشتوو؛ زۆردار؛ دەستەڵاتدار. (قدرتمند)
دەست درێژەوکردن : [چاوگە،ت] دەست درێژ کردنەوە. (ب) پارسەکردن؛ سواڵکردن.(گدایی کردن)
دەستدرێژی : [ناو] زەوت؛ تەجاوەز؛ ئیلاقە؛ هێرش.(تجاوز)
دەستڕاست : [ئاوەڵناو] ئەنگێوە؛ تیرئەندازی لە ئامانجدەر. (هدف‌زن)
دەستڕاستی: [ناو] دەسڕاستی؛ نیشانە ئەنگێوی. (مهارت درتیر اندازی )
دەستڕۆیشتن : [چاوگە،ت] دەستڕۆیین؛ دەستە-ڵات داری . (قدرتمندی)
دەستڕۆیشتوو : [ئاوەڵناو] بالادەست؛ بەدەستە-لات. (ب) دەوڵەمەند؛ تێروتەسەل. (قدرتمندی)
دەستڕۆیین : [ناو] دەستڕۆیشتن؛ دەستەڵاتداری؛ دەوڵەمەندی . (قدرتمندی)

دەستڕۆییو : [ئاوەڵناو] بەدەستەڵات؛ توانا؛ دەست ڕۆیشتووو. (قدرتمند)
دەستڕەنج:[ناو] پارەی پەیدابوو بەڕەنجی‌شان؛ مزی ڕەنج و حەول و تەقالا و زەحمەت‌کێشان. (دست رنج)
دەستڕەنگین : دەستەنەخشین؛ کار جوان و هو-نەرمەند . (دست رنگین)
دەستسڕ : [ناو،ت] دەسرەدەست؛ هەولە. خاولی. (دستمال؛ هوله)
دەستسووک : [ئاوەڵناو] (ب)کەسێک‌کە زیندە-وەر سەردەبڕێت درەنگ گیانی دەردەچێت. (سبک دست)+
دەستشڕ : [ئاوەڵناو] دەستبڵاو؛ هەڵەخەرج. (ولخرج)
دەست شل‌بوونەوە : [چاوگە،ت] (ب)بێمەیلی لە تەواوکردنی‌کارێک؛ دەست نەچوونە کارێک . (بیمیلی به انجام کاری)
دەستقورس: [ئاوەڵناو] (١)کەسێک‌کە مشت و زللەی زۆر بەهێزە .( ٢) ئەگەر ئاژەڵێک سەربڕێت زوو گیانی دەردەچێت. (دست سنگین)
دەستگا : [ناو،ت] دەزگا و مەقام لە-موسیقادا.(دستگاه) +
دەستگر : یارمەتیدەر؛ یاریکار؛ ئاریکار. (یاری-کننده)
دەستگەیشتن : [چاوگە،ت] سەرپەرژان. (فرصت داشتن)
دەستگێڕانەوە : [چاوگە،ت] گێڕانەوەی دەست لە کارێک و لێی پەشیمان بوونەوە.(دست پس-کشیدن)
دەستگیراو: بێ‌دەرفەت؛ سەرنەپەرژاو.(بی‌فرجە)

دەستلقۆک : کردەوە؛ ڕەفتار . (رفتار)
دەستلەسەرسینگ : [ئاوەڵناو] بەئەدەب لە بە ڕانبەر گەوراندا ڕاوەستان و چاوەڕوانی ئەمرو فە رمان، وکردنی فرمان بوون؛ ئامادە بە خزمەت . (دست به سینه)
دەستلێخشاندن : [چاوگە،ت] پەلاندن؛ دەست پیاماڵین.دەست پیا هێنان. (دست مالیدن.لمس-کردن)
دەستلیْشۆردن :[چاوگە،ت] لە شتێک ناهومێد و بیٚ هیوابوون. (ناامید شدن)
دەستلیٚکێشانەوە :[چاوگە،ت]دەستلیٚهەڵگر-تن. (رهاکردن)
دەستمال : [ناو،ت] (١) لەچک؛ دەسماڵ . (٢) دەسرەدەس ؛دەستسڕ. ( ١)لچک ٢)دستمال)
دەستمێژ : [ناو] دەستنوویژ . (وضو)
دەستنڤیس : [ناو] دەستنووس؛دەسنووس.(دست نویس)
دەستنێژ : [ناو،ت] دەستنیا؛ ئەو باخە دەستنێژی خۆمە : خۆم چەقاندوومە.(بادست‌خود کاشته)
دەستواز : [ئاوەڵناو] دەستباز؛ دڵاوا. (باهمت؛بخشنده)> دەسباز
دەست و پا وەشاندن : [چاوگە،ت] دەست و پا لێدان؛ پەلەقاژیٚکردن (دست وپازدن)+
دەستهاڕ : [ناو،ت] دەساڕ. (دستاس)
دەستەبەندی : دەستەکردن و بەستن . (دستە بندی)+
دەستەچن :[ناو،ت](١)جۆرێک تریٚ(نوعی-انگور). (٢)مێوەیێک‌کە بە دەست لەداربکرێتە وە .(دستچین)
دەستەچۆ : [ناو،ت]دارەدەست؛ چێودەست. (چو بدست)
دەستە دار : (١)دارەدەست؛ (٢)داری نێونجی؛ (٣) دەستەدار؛ دەسکدار . (١.چوبدست ٢.چوب متوسط ٣.دستە دار)
دەستەکچ :(١) کچی جەحێڵی منداڵکار. (دختر نو جوان)(٢) گورووپێک کچ. (یکدستە دختر)
دەستەکوڕ : (١)کوڕە لاوی منداڵکار؛ تازەلاو.(٢) گرووپێک کوڕ. (١.نوجوان ٢.یکدستەپسر)
دەس‌تەنیا : [ئاوەڵناو+ ناو] تەنیاباڵ؛ بەتاقی‌تەنیا . (دست تنها)
دەستەواژە : کۆژ؛ ئیستیلاح ؛ وشەی تایبەت بە هەر تیپ و تاقم و دەستە کە واتاییٚکی تایبەت دەگەیٚنیٚ وەک دەستەواژەی بازاڕی، هونەری، مۆسیقایی . (اصطلاح)
دەستە هاڕە : (١) [ناو،ت] دەستاڕ. (دستاس)(٢) دەستەهارە؛ دەسکیٚدەساڕ. (دستە دستاس)
دەستهەڵکردن: [چاوگە،ت] قۆڵیٚهەڵکردن؛ خۆ ئامادەکردن. (آمادە شدن)
دەست هەڵێنان : [چاوگە،ت] (ب)کۆمەک‌کردن، لە شەڕ و ژن‌هێناندا یان هەرکێشەیەکی دیکەدا. (کمک کردن)
دەسخاڵی : [ئاوەڵناو]دەست تەنگ؛ دەستکورت؛ هەژار. (دست خالی)
دەس‌داشۆرین : دەس‌داشوشتن؛ (ب) لە شتێک ناهومێد بوون. (قیدچیزیرا زدن)
دەسدروو :[ئاوەڵناو] دووراو بە دەست.(دست دوز)
دەسرەبادان : [چاوگە،ت] دەسرە هەڵسووڕاندن لە هەڵپەڕیندا . (دستمال دورسر گرداندن)
دەسکەنە : ڕنینەوەی دەغڵی کورتەباڵا بەدەست، کە بەر داس نەکەوێت. (درو بادست)

دەس‌کێشانەوە : [چاوگە،ت] تەک‌دانە دواوە لە سەر سفرە؛ دەس هەڵگرتن لەکار. (عقب کشیدن)
دەسگوڕ : بەئانقەسە؛ بەدانستە؛ دەس‌ئەنقەس . (عمداً)
دەس لە دونیا بەردان : [چاوگە،ت] دەست ژ دنیٚ‌بەردایی؛ دەست لە خۆشی دونیا هەڵگرتن.(دست‌ازدنیاشستن)
دەس‌لەڕەش و سپی‌نەدان (ب) هیچ کاریٚ نەکردن . (دست به سیاه و سفید نزدن)
دەس‌لێداشۆردن : [چاوگە،ت]هومێد بەشتێک نەمان؛ ناهومێد بوون . (دست شستن از چیزی)
دەسەهاڕ : [ناو،ت] دەستاڕ؛ دەسکی دەستاڕ(دستاس؛ دستەدستاس )
دەس‌هەڵگرتن : [چاوگە،ت] ڕەهاکردن؛ لیٚ‌گەڕان؛ وازلیٚ‌هێنان. (دست‌برداشتن)
دەس‌هەوسار : هەفسار؛ دەزگین. (افسار)
دەسکەڕن : گیا و دەغل‌ودان بە دەست ڕنینەوە؛ دەسکەنە . (درو با دست)
دەسکەڕیجە : ئامرازێکە لە کەرەستەی هەلاجیدا(قطعەای‌دردستگاە حلاجی)
دەس‌لاخستن : [چاوگە،ت] لەکێشان و پێواندا فێڵکردن؛کەم فرۆشتن؛کەم فرۆشی(کم فروشی)
دەس لێدریاگ : [ناوبەر] دەس پیاهاوریاک؛ دەستلێدراو؛ شەقل‌شکاو . (دستکاری شدە)
دەس‌لێکێشانەوە : [چاوگە،ت] واز لیٚ هێنان؛ دەست لیٚ هەڵگرتن . (دست کشیدن)
دەسماڵ‌شەرمە : [ناو،ت] چنراوێکە بە بەر لووتدا هەڵدە بەسترێت. (دستمال جلو بینی)
دەس‌نەخواردوو : ئاکبەند؛ دەست لێنەدراو؛ مۆرنە شکاو؛ شەقلٚ نەشکاو . (دست نخوردە)
دەسنووانن : [چاوگە،ت] دەستنووواندن؛ دەستەلات نیشاندان؛ خۆ نوواندن . (خودنمایی)
دەس‌ودڵواز : [ئاوەڵناو] دڵاوا؛ بەهیممەت؛ دڵفراوان. (دست و دلباز)
دەس‌ونەخش جوان : [ئاوەڵناو] کارجوان؛ بەسەلیقە لەکاردا.دەست ڕەنگین. (با سلیقە درکار)
دەس‌وەشێن : [ناو،بک] مشت وەشێن ؛ وەک شاخ وەشێن. (کتک زن با دست)
دەسەخویشک: دەستەخوشک؛ گرۆپێک هاواڵە کیژی هاو تەمەن . (دختران همسال و دوست)
دەسەسەر: دەس‌بەسەر؛ مەژوولٚ؛ خاپاندن؛ فریودان؛ (بچۆ بلی هاتووم بۆ دەسەسەرەکە) ، بە منداڵٚ دەڵێن بۆ ئەوەی بەو سپاردەیە سەرگەرمی بکەن.(دست بسر)+
دەسەڵێن :[ئاوەڵناو] دەستەمۆ؛ دەسگرۆ؛ڕام.(رام)
دەسەناو : ئەسپڕەس؛ دەستەوناو؛ مەیدانە ئەسپێک. (میدانی‌باندازە تاخت اسب)
دەسەوئاوانی : [ناو،ت] دەسکاونگ؛ دەسکی ئاونگ. (دستە هاون)
دەسەهەڵپێکان : پەنجە هەڵپێکان؛ (ب) خەمبار بوون؛ پەنجە تێک هەڵکێشان.(دست بە زانو)
دەسەهەڵگرتن:[چاوگە،ت] دەستەهەڵگرتن؛ وازهێنان؛ لێگەڕان. (دست‌برداشتن)
دەسەهەوسار : [ناو] دەستەوسار. (افسار)
دەسی : [ناو] دەستی؛ نەغد قەرز پێدان؛ (ب) دەستقەرز. (دستی)
دەشتی‌کاکی‌بەکاکی : [ناو] دەشتی چۆڵٚ‌وهۆڵٚ و بەرین؛ بیابانی بیٚ‌پایان. (بیابان‌برهوت)
دەشیٚ :(١) دێنیٚ؛ دەژی. (می‌ارزد). (٢) لە سەر-

چاوەی (شیان)ە ئەشێ بڕۆم. (باید)

دەشیا :(۱)دەیهێنا؛ دەژیا. (می‌ارزید). دەبوو؛ ئـە شیا؛ دەبووا؛ مەشیا. (میبود)

دەغەڵە : [ناو] خەوش؛ نا خالیسی. (غش)

دەفیلە : [ناو] سان؛ ڕێژە؛ ڕێژەو. (سان)

دەڤار : [ناوەت] (۱)دەوار؛ حەیوانی ڕاگیـراو، وە-ک ئەسب و مەڕ و ماڵات.(حیوانات اهلی).(۲)ڕە-شماڵ. (سیاەچادر)

دەڤبکۆتن : پەیمان‌ڕاگر؛خاوەنی‌قسەی خۆی؛ لە بەڵێن‌لانەدەر. (درست پیمان)

دەڤدڕیا : [ئاوەڵناو] زۆربلێ؛ زاردڕاو؛ چەنـەدرێـژ؛ ڕاز ڕانەگر.(رودە دراز)

دەڤڕاست : [ئاوەڵناو+ ناو] ڕاستبێژ؛ قسەکەر لە لایـەن جـەمـاوەرێکـەوە.دەمڕاسـت. (راسـت-گفتار؛سخنگو)

دەڤک :[ناوەت] دەسرەی بەرلووت؛ سـەرپـۆش؛ دەمئاخن؛ زارئاخن . (سرپوش)

دەڤکەن : لێوکەن؛ زەردەخەنە. (لبخند)

دەڤنەرم : مێهرەبان؛ ڕووخۆش . (خوشرو)

دەڤەدەشتی : تەپاڵە کێویلە. (تاپالە)

دەڤەر : [ناو] ناوچە؛ هەرێم. (منطقە)

دەڤێک : [ناو] کلک؛ جووجکە. (دم)

دەقاودەق : تەواو وەک خـۆی؛ عـەینـی شـت . (مطابق)

دەقبەستن : [چاوگە،ت] سافەویستان؛ دەق‌گـر-تنی شتی ئوتووکراو یان قەدکراو؛ شتێ لە حاڵە-تێکدا مانەوە. (صاف‌شدن؛ ماندن در یک‌حالت)

دەقدقاندن :چاوگە،ت] قدیلکەدان؛ ختیلکـەدان. (غلغلک‌دادن).

دەقساندن : چاوپۆشی؛ خستنە پشتگووێ .(چشم پوشی)

دەق‌ودۆغـر: [بـەنـد] ڕاسـت‌وڕەوان؛ بـێ ڕودە-ربایستی‌کردن؛ بێڕووبینی؛ ڕاستەوڕاسـت.(رک-ورو راست)

دەق‌ودەق: [بەند] دەپ و دۆغـر؛ ڕاسـت‌وڕەوان. (ڕاست وبی‌تعارف)

دەڵانە: [ناو] دڵۆپە. نم. شە. شی. (نشت ؛ ترشح)

دەلدەلۆک : > داوداوەکۆسە

دەڵق : [ناو،ت]تەڵق ڕووپەڕی نایلونی شووشـە-ئاسا. (طلق)

دەلووجە : [ناو] بیباری‌سوور. (فلفل قرمز )

دەلوودلێر : [ئاوەڵناو،ت] جوامێر و ئازا؛مێرخاس و دڵقایم . (با جرئت)

دەلووقەل : [نـاو] (۱)مرۆڤـی ڕوو هـەڵمـاڵراوی ئازای چەنەباز. (نترس،حراف) (۲)گـەدە وگـودە. (الوات)

دەڵە : (۱) دەلە؛ زۆرماڵانگەڕ. (دلە).(۲) [پێشـگر] دێل؛ بۆ مێینەی حەیوانگـەلـی وەک سـەگ و گورگ. (سگ و گرگ مادە).(۳) لە چاوگەی دە-ڵاندن وەرگیراوە وەک دەڵەمیز.(چکە)

دەڵەچەیی : نزمی و سووکی و مێچکە مێچکـە-کردن بۆ ئـەم و ئـەو؛ ماسـتاو کـەری؛ (ریـایی)

دەڵەشێر : شێری مێ.(مادەشیر)

دەڵەمیز : [لەچاوگەی دەڵاندن] کەسێک‌کـە بـە خویدا دەمیزێ؛ (شاشو)

دەلیـڤ : [نـاو] هـەل؛ دەرفـەت؛ دەرەتـان. (فرصت)

دەلینگان وەرهاتن : [چاوگـە،ت] پاهـەڵخستن؛ توند ڕۆیشتن.(سریع رفتن)

دەماخ‌شکاندن : [چاوگە،ت]کەیف‌خۆشی لە کە

سێک تێکدان. (حال گرفتن)
دەمارگرژ : [ئاوەڵناو] ڕووتاڵ؛ تووڕە. (عصبانی)
دەمارە : [ناو] ڕەگەی کانزا لە کان(مەعدەن)دا وەک ڕەگەی زێڕ و ئاسن لە ژێر عەرزدا . (رگە)
دەمان: دەمودوو؛ بەکرێ گرتنی زەوی بە دەودوو. (دودهم)+
دەمایی : دوایی؛ دمایی. (عاقبت؛ بعداً)
دەمپایی : [ناو،ت] مداس؛ چەکچەکیلە؛ کەوشی سەرپایی . (دمپایی)
دەمتەقێن : [ناو،بک] (ب)[ئاوەڵناو] چەنەباز؛ فرەوێژ؛ درێژدادڕ. (پرحرف)
دەمتێوەدەر : (ب)خۆتێهەڵقورتێن بە قسە . (فضول)
دەم چەورکردن :[چاوگە،ت] (ب) سمێل چەورکردن؛ دەمشیرینی پێدان؛ ڕشفەت دان.(سبیل چربکردن)
دەمخۆشی : [ناو] ڕاوێژخۆشی؛ زمان-شیرینی.(شیرین زبان)
دەمدادان : (ب) سەرلە لەوەڕکردنی ئاژاڵ. (چریدن حیوانات)
دەمدەمان : دەمبەدەمەوەنان؛ ڕامۆسینی زۆر و لێو لەسەرلێو. (بوسیدن زیاد)
دەمدەمانی : دەمدەمانێ؛ ماچ‌گۆڕینەوە؛ دەم بە-دەمەوەنان . (لب بر لب)
دەم ڕانەوەستاو : [ئاوەڵناو] (ب) قسە درکێن؛ ڕاز درکێن . (افشاگرراز؛ دهن گشاد)
دەمژمار : کاتژمێر . (ساعت)
دەمسارد : [ئاوەڵناو] تانجی‌کە بە نێچیر دەگا بە لام درەنگ نێچیر بگرێت.(تازی کە دیر شکار را بگیرد)

دەمشیرینی : [ناو،ت] ڕێزانە؛ ئەنعام؛ خەڵات پێدان بابەتی چاک ئەنجامدانی کارێک.(ب) ڕشفەت (انعام؛ رشوە)
دەم قورس : [ئاوەڵناو] ڕازهەڵگر؛ ڕازدار؛ قسە نەدرکێن.(دهن قرص)
دەمکۆ : دەمکوت؛ سەرزەنشت. (سرزنش)
دەمکوڵ: دەم ولێو چکۆلە؛ دەمخونچە .(غنچە دهن)
دەمکێش : (١) سیغارکێشێک کە دووکەڵ ناباتە نیۆ سێیەکانی و قووتی نادا. (دهن کش) (٢) مادە (دۆشەکچە)ی سەر نانەوەی (پڵاو) بۆ دەم-کێشان. (دە مکن)
دەمگەنیگ : جۆرێک جوێنە؛ زاربۆگەن . (دهن گندیدە)
دەملدەست : [ئاوەڵناو] دەمودەست؛ خێرا؛ ئازا؛ زوو؛ فەوری. (فوری)
دەم لەدەمنان : [چاوگە،ت] (١) دەمدەمان‌کردن و ڕامۆسین. (لببرلبگذاشتن)(٢) سەرخستنە سەر؛ شەڕە چەقە لەگەڵکردن (دهن‌بەدهن گذاشتن)
دەم لەسەرپشت :کەوتنە دوای بێ‌ماوەی تانجی بە شوێن نچیردا. (بی فاصلە دنبال دویدن)
دەملێنیان : [چاوگە،ت]دەم پێوەنان؛ دەم بەکا-نییەوە یان کاسەی پڕ لە تراوەوە نان. ( کنایی نوشیدن)
دەموجەم : [ناو] (ف.گیو) ئابۆر. (اقتصاد)
دەمووش : [ناو] (ف.گیو) شیلەی چتی شیرین . (شیرە شیرین)
دەمەت : [ناو،]تووتنی وەڵاشمی لە سەریەک دانراو و کۆگاکراو . (کپە توون چیدە شدە)

دەمەترشتە :[ناوەت] (١)دەمەتەشوێ؛(٢) تۆلاشە؛ تۆلاش. (تیغەتیشە؛تراشە چوب) +
دەمەرقاجان : ئاوربازی لە شایی و شادمانیدا.(شادی وآتش بازی)
دەمەرقۆپان : [ناوەت] پانتۆڵ؛ پاتۆڵ. (شلوارکردی)
دەمەزەردە : بێچووی مەل کە هێشتا زەردی دەندووکی ماوە . (جوجە کە هنوز نوکش زردی دارد)+
دەمەقەیچی : [ناوەت] لەت و کوتی قوماش و قاقەزکە لە بڕیندا یان ڕێککردندا دەمێنێتەوە.(دم قیچی؛ پرت)
دەمەوچوون : [چاوگەت] پیریەوە چوون؛ پێشواز کردن . (پیشواز کردن)
دەمەوژوور : [ئاوەڵناو] سەرەوژوور . (سربالا)
دەندووکبێلە : [ناوەت] فڕندەیەکی کۆچەریە، نیومیتر درێژە و سپی ڕەنگە،دەندووک و باڵی ڕەشە و سەری دەندووکی زەردە. (کفچەنک)
دەندووکسوورە : [ناوەت] فڕندەیەکە بەقەرای قەلەبانەییی دەبێت، سینگ و پشتی ڕەشە و باڵی سپیە. (صدفخور)
دەنگدابڕین : [چاوگەت] ڕەوتی توران و زیزبوون. (قهر کردن)
دەنگدان : [چاوگەت] هاندان؛ فرماندان؛ بانگکردن؛ بەڵام بۆ فرمان بە حەیوان زیاتر وشەی تورکی بەکار دەبرێ (١)بۆ بزن( گدی) واتا جوان ،گدی واتالاچۆ: یخخە، (٢)بۆ کەر (هۆش یا هێش) کورتکراوەی هێشەکە، (٣) بۆ سەگ کاتی پێوەڕووان، (سوواربوون)، (سیک-سیک). (٤)بۆ سەگ کاتی دوورخستنەوە (چخ) واتا دەرکەوە،(٥) بۆ کەڵەشێر لە وەختی شەڕە-کەڵەشێردا دگل، (دگلدگل دانت دەدەم) ، (٦) بۆ وشتر لەکاتی چۆک داداندا (یخ) واتا بکەوە ،بخەوە.(٧) بۆ گامێش،، (یە لی ) بە زاراوەی سوواوی تورکی واتا. (یاعەلی)کاتێ لە ژێر باری قورس دایە؛(تهییج کردن)+
دەنگگڕ:[ئاوەڵناو] دەنگ بۆڕ؛ دژی زیل.(صدای بم)
دەنگوڕەنگ: [ناوەت] دەنگ و سیما.(ب) دە نگ و ڕەنگبەر: تەلەفزیۆن.(صداوسیما؛ تلویزیون)
دەوان : دەبان. (خنجر ازفولادجوهردار)
دەور : ڕۆڵ؛ نەقش؛ کایەکردنی ئەکتەر کە لە فیلمدا دەور دەگێڕێ . (نقش بازی کردن)+
دەوربەسەرچوون : [چاوگەت] لە باوکەوتن؛ لە برەوکەوتن؛ لە بیرخەڵک چوون؛ دەوری چە قۆکێشی بەسەرچوو ،تەواو بوو.(زمان بسرآمدن)
دەورە : (١) چاخ؛ سەردەم؛ دەورەی نادرشا. (زمان نادرشا).(٢) زەمانی دیاریکراو بۆ دەسپێک و تەواوبوونی کارێک، دەورەی ئاوسبوون نۆ مانگە. (دورە بارداری).(٣)کارێ کە بەشێوەی چەرخین و گەڕان بەڕێوەبچێ، دەورە میوانی. (دورە مهمانی).(٤) ڕەوتی غارغارێن بە ئەسپ بەشێوەی جەغز سووڕانەوە. (دوانیدن اسب بصورت دایرە).(٥) تەواوکردنی ماوەی چوونە وانەی فێربوونیکارێک؛ وەک: دەورەی میکانیکی. (دورە).(٦) گەڕان بەشار وگونددا وە-ک چەرچی دەورەگێڵی(گەردی).(دورە گردی).(٧) وانەی فێرکاری تەواوکردن(دەورە دیە)دەورە دیدە: (ب)کارامەبوون و پسپۆڕبوون

له کارێکدا . (دوره دیده)(٨)کتێب و نووسراوەی پێویستی وانەیێک، دەورەی پۆلی چوارەمی سەرەتایی نۆکتێبە.(دورەکتاب‌یک کلاس)
دەورهەڵگرتن : [چاوگە‌ت] (١) سەیارە کەوتنە سەر باری توند ڕۆیشتن. (دور برداشتن). (٢ب) تەنگ پێ‌هەڵچنین و پەیتا پەیتا قسە پێوتن و سەرزەنشت کردن بە تووڕەییەوە . (دور برداشتن)
دەورەیی : هەتا قەوان نەبیوو بەباو، گۆرانی کوردی دەورەیی(پێرپۆدی) بوو هەرچەند ساڵ جارێک بەشێوەی (دەورەیی) بۆماوەیێک زیندو دەبوومەوە و دیسان فەرامۆش دەبوو، دوای چەندساڵ دیسان دەهاتەوە کایە. (دورەای)
دەورێش : [ناو‌] عەودال؛ دەروێش . (درویش)
دەولک : [ناو‌] سەتڵی ئاو هەڵکێشان؛ دۆڵچە. (سطل)
دەوڵەت‌کەتی : لێقەوماو؛ هەژار؛ لێکەوتوو. (از قدرت افتاد)
دەوڵەتی: [ئاوەڵناو] سەربە میری؛شتێک‌کە خاوەندە کەی میر و حوکوومەت بێت. (دولتی)
دەوڵەقووچ : [ئاوەڵناو] زاربەستوو؛ هەژار؛ دەم‌قووچاو؛ بێدەنگ. (بیصدا؛ بینوا)
دەوە: (١)دمبە؛ دمبە؛ دەفری نەوت و تراو تێکردن.(دبه) (٢) دمبە کەڵەگای نەخەساوی مل ئەستوور. .(گاوگردن‌کلفت)+
دەیر : [ناو‌]کلیسا ؛ کنیسە . (کلیسا)
دەیلاخ : [ناو‌] دەیلاخ ؛ بەچکە وشتری یەکساڵە. (بچه شتر یک ساله)
دەیمیلە : [ناو‌]دێمیلە؛ کەردڕە. (نوعی‌ارزن‌درشت)
دەیندک : [ناو‌] چەقالە بادەم؛ باهیف تەڕ. بادام؛ چغاله).
دیاپازۆن : فرد فد؛ اند: [ناو‌] ئامێرێکە بۆکۆک‌کردنی کەرەستەگەلی مۆسیقایە کە دەنگی نۆتەکانی مۆسیقای لێدێ و نەگۆڕە. (دیاپازون)
دیار : [ناو‌ت] وڵات؛ وڵایەت.(ولایت)+
دیارە : (١)لە بەرچاو دیارە؛ بە بەرچاووەیە.(جلو چشم است) (٢ب) ڕوونە ؛ مەعلوومە . (معلوم است)
دیاکۆ : ئەوەڵین پادشای مێدیا(ماد) کە لە ناوچەی هەمەدان سەری هەڵدا؛ لە وشەکانی(دیائوکۆ، دایائوکو، دیا ئاوک )ەوە هاتووە. ناوی سەردارێکی بەناوبانگی سەردەمی هەخامەنشیان بووە.(اولین پادشاه ماد. دیاکو)
دیالۆگ : اند؛ فد: پەیفین. دەستەواژەی سینماییە واتا قسە کردنی ئاکتەرەکان لە فیلم و شانۆدا. (دیالوگ)
دیبا : جۆریک قوماشی ئەتڵەس. (دیبا)+
دیدەی‌بەد : چاوی پیس. (چشم شور)
دیٚ‌دیٚ‌تیٚ : (د.د.ت) فرد؛ فد؛ اند: پۆدرێکی سپی بۆ لەبەین‌بردنی جڕوجانەوەر. (د.د.ت)
دێراو : کەردوو؛ (قاناو، لە تورکییەوە هاتووە): کەردووی مێو. (کرت) +
دێراو : (١) هەڵکۆڵراو؛ دەردراو؛ دێراو؛ کەردوو. (٢) ڕابووردووی چاوگەی دان؛ دراو؛ وەک :ئاودێراو: ئاودراو، کەئاودێرئاوی پێداوە(کرت؛ آبیاری‌شده)
دێرندێر : ئاورێک‌کە فەلەکان لە نیوەی مانگی ڕەشەمەیدا دەیکەنەوە(آتشبازی عیسویهادرنیمه‌اسفند)
دێرنشینی : دەیرنشینی؛ کلیسا نشینی. (ب)تەنیایی و دوورە پەرێزی و دەست لە دونیا بەردان

(دیرنشینی)
دیرەگ : هەوراز؛ تەپ؛ تەپی درێژ؛ تیرە-شان.(تپه دراز)
دیژبان: [ناو،ت] چاودێری قەڵا. (دژبان)
دیژبانی : چاودێریی قەڵا؛ (ب) مەرزینگەیێکە چاوەدێری بەڕێوەچوونی یاسای عەسکەریە. (دژبانی)
دیسک :فرد؛فرانْد؛ [ناو](١) رووپەڕێکی جەغزئاسا وەک قەوان لە ئامێری کامپیوتێردا (فلاپی دیسک) (٢)ڕووپەڕێکی کانزایی دوو کیلۆییە بۆ وەزرشی دیسک هاویژتن. (دیسک).(٣) ڕووپەڕێکی جەغزئاسایە لە دەزگای تۆرمزی سەیارەدا. (٤) کرۆژ کرۆژەی خڕۆڵە لە ناو موغەرەی پشتدا.(دیسک).(٥) نەخۆشینی دیسک؛ ئازار پێگەیشتن یا ترازانی دیسکی موغەرەی پشت . (دیسک)
دیغ: [ناو،ت] خەت. هێڵ. (خط)
دیغ‌دیغ : خەت‌خەت؛ هێڵ‌هێڵ؛ ڕێ‌ڕێ . (راه راه)
دیڤدیڤک : [ناو،ت] کرمی ڕیخۆڵە. (کرم روده)
دیڤێن: پێتەخت؛ پاتەخت . (پایتخت)
دیقلۆک :[ناو،] باپشکێو؛ قنچکەسلاو؛ چینچکە-سڵاو؛ سیتکەسڵاو . (گل مژه؛ سنده سلام)
دێکرن : [چاوگە،ت] دیتن؛ تماشاکردن؛ ڕوانین. (نگاه کردن)
دیلات : داوەت ؛ شایی؛ زەماوەند؛ دیلان. (جشن عروسی)
دێلاف : [ناو،] ڕێژگەی ئاوی ڕۆبار. (جائی که آب رودخانه در آن میریزد)
دیلماج : [ناو،] لە تورکییەوە هاتووە(دیل واتا زمان) وەرگێڕی قسە بە زمانێکی‌تر . (مترجم)
دیلوان : [ناو،] دەرزی تەبەنە؛ دەرزی لێفە دوورین. (سوزان لحاف دوزی)

دێلەسە : دێڵەسەگ. (لگ ماده)
دێلەڤ : [ناو،] جێگا.(جا)
دێلەوەوا : [ناو،ت] دێڵەبەبا. (سگ گشن خواه)
دیلی :حاڵەتی بەندی بوون؛ گیراوی لەشەڕدا. (ب) بندەستی؛ ژێرچەپۆکەیی . (اسیری)
دیمانی : ماندنەوە؛ ماندگار؛ دژی کۆچەری . (ماندگاری)
دێن : (١) ئەوانیش دێن؛ (داهاتی هاتن) (می آیند).(٢) زەین؛ دێنا خوە بدێ: سەرنجی بدەری: تماشای‌بکە.(ذهن)
دین : (١)دێین؛ ئێمەیش دێین.(میآئیم).(٢) سەرنج ؛ زەین؛ دیناخوە بدێ .(ذهن) ٧٦٥.۴>ف.هن.
دین‌سس: لە دین‌سزی تورکییەوە هاتووە واتا: بێ‌دین. (بیدین)
دێو : (١)بابچینە ئەو دێو : بابچینە ئەو دیو: ژوورەکەی‌تر. (اطاق).(٢) ئەودێوی تووشاکە : تەماشای (ئەودیو)ی، واتا ڕووەکەی تری بکە. (ڕوو؛ اطاق؛طرف)+
دیواچە : دیباچە؛ پێشەکی بۆ کتێب ؛ پێش‌وتار. (دیباچە)
دیواری‌ئاگر : لە فەننی هەمارداریی نوێدا چەند کورتە دیوار کە هەمار دەکاتە چەند کەرت بۆ بەرگری لە ئاورگرتنی هەمووکاڵای هەمارکراو. (٢) لە عەسکەریدا چەند موسەلسەلی دژی فڕۆکە مەودایێک ڕاست و چەپ ومبەر دەستڕێژ دەدەن کە فڕۆکە نەتوانێ بەساغی لەوبەر هەڵستە دەربازبێت.(دیوارآتش)
دیوان : ئامرازێکی مۆسیقایە کاسەکەی لە سێتار گەورەترە. (دیوان)
دێولان : دێگولان؛ شارێکە نزیکی سنە واتا لانی‌دێو؛ بە هەڵە دێ گولانی پێدەڵێن.(دهگلان)

داشبۆرد : [ناو] اند.فد. ڕووپەری بەردەم شۆفێر لە سەیارەدا. (داشبرد)
داغی : [ناو] کورتکراوی داغانە؛ کەرەستەگەلی- هەڵوەشاوی خراپبووی مۆتور. (داغی)
درێل : [ناو، درێل؛ مەتێ؛ کەرەستەی کون- کردن بە مەتە. (درل)
دوئیل :فد؛ فرد؛ اند؛ [ناو، شەڕ و ململانێ لە سەر ئابڕو تامردن، لە ئورووپای قەدیمدا . (دوئیل)
دوال : [ناو، سیرمە؛ تەسمەی چەرم یاپێست . (رشته باریک پوست)
دووبلۆر : [ناو،بک] ئەوەی کاری گوتنەوەی قسەی ئەکتەرەکان بە زمانێکی دی دەکا؛ پاچڤەکەری فیلمی سینما. (دوبلور)
دووخان : [ناو، ] دووکەڵ. (دود)+
دووش گرتن: [چاوگە،ت]کوردی نییە بەڵام هەموو خەڵکی سەقز تا کرماشان دەیڵێن واتا ئاوبە خۆداکردن لە حەمام و ژێر دووشی گەرماو چوون.(دوش گرفتن)
دوونپەروە : فد: [ئاوەڵناو] دونیای دوونپەروەر: دونیای خوێڕیپەروەر. (دون پرور)
دەبەنگی : [ناو] حۆلی؛ وڕی؛ سەرسامی؛ گێژی؛ کاسی. (دبنگی)
دەربوداغان : [ئاوەڵناو] شتی تێکومەسکەندراو؛ یان بە سەریەکداشکاو. (درب و داغان)
دەستەودایرە : [ناو،ت] لەفارسەوە هاتووەتە نێو زمانی کوردی؛ گرۆپی دەوروبەر؛ زیاتر بۆ هەوادارانی ڕامیاری دە وترێ. (دسته ودایره)
دێکۆپاژ : فرد؛ فد؛ [ناو، دابەشکردنی سناریو؛ (فیلم نامه) ؛ دەستەواژەی سینماییە . (دکور پاژ)

دێکۆر : [ناو] خەمڵاندن وڕازاندنەوە و چنینی کەلوپەلی ماڵ بەشێوەی جوان و دڵخواز و بەرچاو؛دەستەواژەی سینما و شانۆیە خەمڵاندنی ڕوانگەیێک کە فیلمی لێهەڵدەگیرێ . (دکور)
دێکوڕاتور : خەملێنەری دێکوڕ؛ پسپۆڕ لە هونەری دێکۆڕاسیۆندا. (دیکوراتور)
دێکوڕاسیۆن : ڕەوتی ڕازاندنەوەی دێکوڕ؛ ڕازاندوەی ناوماڵ یان هەرجێ. (دکوڕاسیون)

# ر

ڕابوار : [ناو] ڕێبوار. (رهگذر ؛ رهرو)
ڕابووردن : [جاوگە،ت] دەبازبوون و تێپەڕین؛ لەشوێنێکەوە دابگردن و ڕۆیشتن. (گذشتن. ردشدن)
ڕابوێری : [ناو] ڕابواردن؛ گوزەرانکردن؛ (ب) ژیانی خۆش کردن؛ لەکەیف و ئاهەنگدا بوون. (معیشت؛خوش گذرانی)
ڕابە :(١)[ناو] ڕابی؛ کورتکراوەی ناوی ڕابێعە و ڕابێعا (رابعە) (٢)[ئەمری لە چاوگەی ڕابوون] هەڵسە. (بلند شو)
ڕابەزاندن: [جاوگەت] پێوەستان؛دەرەقەت هاتن. (مقابلەکردن) +
ڕابەل : [ئاوەڵناو] تووڕە؛ قەڵس. (عصبانی)
ڕاپازنین :[جاوگە،ت] وەک: گوشینی پەنیر و چێکردنی پەنیری سەلک؛ گوشینی جلک و قوماشی شۆردراوی تەڕ. (فشردن پنیر و لباس شسته)
ڕاپووت : [ناو] باری پانایی ئاڵوار و تەختە دار، کە لە بواری ئاوخۆرەکاندا نەبێت. ( ؟ این لغت در فارسی پیدانشد. حالت عمود بر آوندها )
ڕاپەڕاندن : [چاوگە،ت] پەڕاندنەوە؛ ڕزگارکردن. (گذراندن)
ڕاپەژلین : [چاوگە،ت] سەرکەوتن؛ چوونەسەر. (بالا رفتن)
ڕاپەلین : [چاوگە،ت] پەڕینەوە. (عبور کردن از آب)

ڕاپێچ : ڕامالْ. (جلو انداختن و روبیدن)
ڕا پێکردن : [جاوگە،ت] پرس پێکردن.(رای‌خواستن)
ڕاتڵەقاندن : [چاوگە،ت] تەقاندنەوە؛ ڕاوەشاندن و سووڕهەڵدانی بێژنگ و کەو بۆ پاککردنەوەی دەغڵ. (چرخاندن غربال)
ڕاتڵەکاندن : [چاوگەت] ڕاتەکاندن؛ تەکان‌دان؛ بزواندن و لە خەو هەڵساندن. (تکان‌دادن)
ڕاتۆڵ : [ئاوەڵناو] ڕاتوول؛ ئاوارە؛ گەڕان و سەرگەردان. (آوارە)
ڕاتوە : [ناو] مووچەی دەرس خوێندن؛ یاریدەدانی خوێندکار لە باری ئابووریەوە. (بورس؛ راتبە)
ڕاتەکیان : [چاوگە،ت] ڕاتەکان؛ تەکان‌دان. ڕاوەشان. (تکان دادن)
ڕاتەوراندن : [چاوگە،ت] بەگوریسی درێژ بەستنەوەی ماڵات بۆ لەوەڕ. (با طناب بلند حیوانات را بستن برای چرا)
ڕاجە : [ناو]کاریتەی خانوو؛ داری‌دارەڕا. (الوار سقف خانە)
ڕاجە : هێندد: نازناوی ئاغا و سەرعێل لە هێندوستان. (راجە)
ڕاچاف : [ناو] زێرەوان؛ چاودێر؛ ڕەچاو.(نگهبان)
ڕاچاف‌کرن : [چاوگە،ت]زێرە وانیکردن. (مواظبت‌کردن)

ڕاچڵەکانـدن : [چاوگـە،ت] داچڵـەکانـدن؛ ڕاپەڕاندن. (ترساندن ناگهانی)

ڕاچڵەکین : [چاوگە،] داچڵەکین؛ ڕاچەنـین. (یکەخوردن)

ڕاچوواندن : [چاوگـە،ت] تێڕاکـردن؛ تـێ-ڕۆکردن. (فروکردن)

ڕاچـە رانـدن : [چاوگـە،ت] لـەوە ڕانـدن. (چراندن)

ڕاچەنیو : [ناو،بـک] ڕاپـەڕیـو؛ داچڵـەکیـو؛ داچڵەکیاگ. (یکە خوردە)

ڕاخستی : [ناو،بـەر] پانقـەکـری؛ ڕاخـراو؛ داخراو؛ پانەوەکراو؛ داخریاگ. (پهن شدە)

ڕاخشکرن : [چاوگـە،ت] خۆئامـادەکـردن؛ خۆتەیارکردن. (آمادە شدن)

ڕاخ و ڕەخ : [ناو] چوارکەنـار؛ دەورانـدەور . (دورتادور)

ڕاخووت : ڕاخۆت؛ ئـەڕای‌خـۆت؛ بۆخـۆت. (برای خودت)

ڕادار : [ناو] ئـامێری وەرگرتنـی شـە پـۆلی هەوایی، زیاتر بۆ ئاگادەری سـەبـارەت بـە هەبوونی فڕۆکە و مووشەک لـە عاسـماندا. (رادار)

ڕاداشتن : >ڕادیران

ڕادان : [چاوگە،]ئەسپەکەی ڕادا:غاری پێ-کرد؛ ئاژووتن و بەغار ڕەتاندن. (تاختن)+

ڕادان : [چاوگــە،] (١)ڕامـــاڵین؛ مـــاڵین. (روبیـدن)(٢)وەپـێش‌خـۆدانی هـەرشـت ، زیـاتربۆ ئـاژاڵ و لێخوڕینیـان دەوترێـت. (هدایت گلەبەجلو) (٣)ڕێگادان؛ ڕێگەپێدان. (راەدادن)

ڕادیاتۆر : [ناو] کەرەستەی (سارد یان گـە-رم) کردنـی ژوور وسـاردەوەکـەری ئـاوی سەیارەیە بە پەرەگەلی ناو هەڵۆڵـەوە لـە - شۆقاژ و سەیارەدا ،کە ئاو لە ناویـدا دەگـە-ڕێت. (رادیاتور)

ڕادیتن : [چاوگە،ت] پـەرمـان؛ پیـاڕادیتن: پیاپەرمان. (جای اطمینان و چشم داشت)

ڕادێـر : [ناو،بـک] کـەسـێک کـە کـاری ڕاهێشتنی منداڵە. (کار سرپا کردن‌بچە)

ڕادێران : [چاوگە،ت] ڕاهێشـتن؛ ڕاداشـتنی منداڵ بۆ میز کردن. (سرپا کردن بچە)

ڕادێران : [چاوگـە،ت] (١) ڕاداشـتن. وەک: فانووس بۆ کەسێک گـرتن. (مانـنـد:چـراغ برای کسی گرفتن) (٢) بە تەنـاف شـتێک شـۆڕکردنەوە یـان تـەنـاف شـل کـردن و شۆڕکردنەوە. (چیزیراباطناب، یافقط طنـاب را پایین فرستادن)

ڕادیشـۆ : [ئـاوەڵـنـاو] مـەیخـۆش؛ تـرش-وشیرین؛ مزر. (ترش و شیرین)

ڕاڕایی : [ناو] دوودڵی؛ هەرتاو لـەسـەرمـە-ڕامێ؛ وازوازی. (دمدمی مزاج)

ڕاڕەنگی : [ناو] ڕاڕنگی؛ نارنگی. (نارنگی)

ڕارەوی : (ب) هەڵکەوت. (اتفاقی)

ڕاز ڕاگر : [ئاوەڵناو] ڕازدار؛ جێی متمانـە بـۆ نەدرکاندنی سوڕ. (رازدار)

ڕاز نووس : [ناو] سـکاڵا نـووس؛ عـەریـزە نووس. (عریضە نویس)

ڕاز و نیـاز : [نـاو] قسـەی پـەنامـەکـی و عاشقانە یا بـە نـەهێنـی دۆعـاکردن. (رازو نیاز)

ڕازاو : خەمڵاو؛ نێـوی ئـافرەتانـە. (آرایـش شدە؛ نام زنانە)

ڕازتن : [چاوگە] دروومان؛ دوورین؛ جل-
دوورین. (خیاطی)
ڕازراف : [ئاوەڵناو] مەزەدار؛ بەچێژ؛ بەتام.
(خوشمزه)
ڕازگۆ : کەسێک کە نهێنی دەخاتە ڕوو؛
(ب) زەڕدەشت؛ تێبینی: (ڕاز) و (ڕاست)
دوو واتای دوورلە یەکیان‌هەیە، کاتێ‌کە ڕاز
وێژرا و خرایە ڕوو لە ئاخافتندا(ڕازگۆ) و
(ڕاستگۆ) لەیەک نزیک دەبنەوە؛ > ڕازوە-
شێر و ڕاست‌وەشێر (رازگو)
ڕازنای : [چاوگە] ڕازاندن؛ خەملاندن؛
جوان‌کردن. (آراستن)
ڕازوەشێر : [ئاوەڵناو] سوڕپۆش؛ ڕازڕاگر.
(سرنگهدار)
رازیانەتوونە : [ناو] گیاییێکە لە هەورامان و
پاوە زۆرە و دژی‌کرمە، بەتایبەت‌کرمی(ئە-
نکیلۆستۆم). (نانخواه؛ زنیان)
ڕازیانەکێویلە : [ناو] ڕازیانە ڕۆمی گیاییێکە
بۆ چارە سەر کردنی بەردی گورچیلە بەکە-
ڵکە. (بادیان‌رومی؛ انیسون)
ڕازیاوە : [ناوبەر] ڕازاوە؛ خەملیو. (آرایش
شده)
ڕازیای : [چاوگە] خەملین؛ خەملان؛
ڕازاندنەوە. (آرایش شده)
ڕازی‌بوون : [چاوگە،ت] قایل‌بوون؛ مل-
دان‌بەکردنی‌کارێک. (راضی‌شدن)
ڕازی‌کردن : [جاوگە،ت] قایل‌کردن.
(راضی‌کردن)
ڕازۆ : [ناو] هەڵهێن؛ ڤەشارتی؛ نوکتە.
(معما)
ڕاژەوانی : [ناو] شروڤەکاری؛ شروڤەکەری؛
راڤەکەری. (تفسیرگری)
ڕاژێر : [ناو] لای خوارووی؛ (ب) باشوور؛کاتی
تماشاکردنی خەریتەی جوغرافیا وا باوە کە
باکوور لە لای سەرەوە ڕادەکرن و باشوور
دەکەوێتە لای خواروو. (غرب)
ڕاژێنەر : [ناو،بک] جوڵێنەر؛ هەژێنەر؛ تە-
کاندەر. (تکان دهنده)
ڕاس : [بەند] ڕاست؛ دروست؛ ڕاست لە
نیمەشەودا هات؛[ناو] شانی‌ڕاست. (درست؛
سرموقع؛ طرف راست )+
راس : [ئاوەڵناو] بێدرۆ؛ بێ کووڕایی؛ قسە-
ی‌ڕاست. (راست ودرست)
ڕاس‌پۆش : [ئاوەڵناو] ڕاست پۆش؛ درۆزن؛
ڕاستی وەشێر؛ ماف‌کوژ. (حق کش)
ڕاسپێر : (١) ڕاسپێردراو. (سفارش‌برنده.
فرستاده)(٢)کەسێک کە ڕادەسپێرێت یان
ڕادەسپێردرێت. (سفارش دهنده)
ڕاست : (بەند)کاتی‌گونجاو؛ ڕاست لە نیمە-
ڕۆدا هات: درست لە نیمەڕۆداهات.
(درست)+
ڕاست : [ناو] دژی چەپ.
ڕاست : [ئاوەڵناو] ڕاست چەقیو؛ هەواڵی
ڕاست؛ هێڵی ڕاست.
ڕاستاڤەکری : [ناو] ڕاست کراوە؛ ئاشکرا
کراو. (آشکار شده)
ڕاستک : [ناو] خەتی بەینی قژە سەر. (باز
شدن فرق مو)+
ڕاست‌کردنەوە : [جاوگە،ت] (١) لابردنی
هەڵەی نووسراو. (تصحیح) ٢) خواروخێچی
لابردن. (راست کردن)
ڕاست‌کەتی : [ئاوەڵناو] شیاو؛ لایق؛

گونجاو.(سزاوار)
ڕاستگەڕیای: [چاوگـە،ت] ڕاسـتگـەڕان؛ وەدیهاتن. (تعبیر راست)
ڕاستۆ : [ئاوەڵناو+ بەنـد] ڕاسـتگۆ؛ سـەربـەست؛ ئازادبێژ ؛ ڕاست و ڕەوان. (بی پرده پوشی؛ صادقدرصحبت)
ڕاستهاتن : [چاوگە،ت] تووش یەکترهـاتن؛ ڕێکەوت. (برخورد؛ اتفاقی)
ڕاستەپێ : [ناو، ت] قرچەپێ؛ بەلەز لەبـەر هەڵسان. (فوری جلو پا بلند شدن)
ڕاستەکەوان: [ناو، ت] دووهێلی سەر چـە-ماوە ڕووبەڕووی یـەکتـرین کـە لـەکـاتی نووسیندا چەند جووت‌کـەوان دەگرنـە بـەر خۆ وەک [ ] (کروشه)
ڕاستەوڕاست : [ئاوەڵناو] بەبێ لاکردنەوە و لاڕێکردن؛ یەکڕاست(ڕاستەوڕاسـت) هـاتم بۆ ئێرە؛ (مستقیم)
ڕاستەوڕاست : [بـەنـد] ڕێکوڕاسـت؛ دەپـو دۆغـر؛ ڕاسـتو ڕەوان؛ (بـەطـور مسـتقیم؛ مستقیماً)
ڕاستی : [بەند](١) بە ڕاسـتە قینـە. (٢) بـۆ پرس‌کردنە؛بـە ڕاسـتی؟ واتـا درۆ ناکـەی. (راستی)
ڕاسـتی : [نـاو] ڕەوتـی ڕاسـت بـوون؛ ڕاستکرداری. (راستی)+
ڕاسـتی : [وتـەیپرسـکردن] بۆسـەرنـج ڕاکێشان؛ ڕاستی،نەتگوت چەندە قەرزاری؟ (راستی)
ڕاسلەر : [ئاوەڵنـاو] ڕاسـتە؛ دژی چـەپلـەر. (راست دست)
ڕاسهاتن : > ڕاستهاتن.

ڕاسـەر : (١)لای ژووروو؛ سـەرەوە.[نـاو] باکوور> ڕاژێر. (طرف بالا)
ڕاسەرین : لای بەرزییـەوە؛ لای سـەرەوە؛ لایبڵێندایی‌وە. (طرف بالایی)
ڕاش : [ناو] دارێکی جـەنگـەڵیـە لـە قـە-لاشکاریدا کەڵکی‌هەیە. (راش)
ڕاشکا : [ڕابوردووی ڕاشکان] شـەو ڕاشـکا ئەژنۆم شل‌بوو مانگ بـە تـاقی ئاسـمانەوە هەڵپرووکا. (پەشێو) شەق بوو. (نصف شد)
ڕاشـکان : [چاوگـە،] شـەق بـوون؛ شـەو ڕاشکان: شەو شەق بوون. (نصف شدن)
ڕاشکاندن : [چاوگە،ت] تێپەڕکردن؛ ڕاقـە-تاندن. (گذشتن)
ڕافڕیای : [ناوبەر] ڕفێنراو. (ربوده شده)
ڕافڕووت : [ناو،ت] ڕاوە ڕووت؛ جەردەیـی؛ تەریدەگەری. (رهزنی)
ڕاقوڕۆ : [ناو،ت] گەڕان؛ هاتن و چوون. بە-شوێن شتێکدا گەڕان. (جستجو)
ڕاڤەنان : [چاوگـە،ت] ڕاونـان؛ دەرکـردن؛ دوورخستنەوە. (بیرون کردن)
ڕاقوت : [ناو] ڕێگر؛ تەریـدەی سـەر جـادە (رهزن)
ڕاقـەتانـدن : [چاوگـە،ت] جـویێکردنـەوە؛ قرتاندن؛ ڕاشکاندن (جداکردن)
ڕاکـالین : ڕاپـەڕیـن بـە غـار و چوارنـاڵ. (پریدن و دویدن حیوانات)
ڕاکرن : (١)[چاوگـە] لـەخۆبـەسـتن؛ لـە-خۆقاییم‌کردن؛ قایش‌لەخۆم‌ڕاکەم: لەخۆمی ببەستم؛ لەبەرکردن. (بستن؛ پوشـیدن) (٢) غارکردن و هەڵـاتن. (فرارکـردن)(٣) بـە-رزکردنەوە. (بلند کردن)

ڕاکەوەی : [چاوگە،ت] داسرەوتن؛ داکەوتن؛ ئارام بوون. (آرام شدن)
ڕاکێشان : [چاوگە،ت] ژنی مێرد دار بە زۆرە ملی زەوت کردن؛ (کەمتر بە بێ مەیلی ژن ڕووی داوە) (غصب کردن)+
ڕاگرتی : مرۆڤی بە ڕوومەت و سەنگین و گران. (شخص محترم)
ڕاگۆستن : [چاوگە،ت] ڕاگوێزتن؛ گوێزتنەوە. (جابە جاکردن)
ڕاگومکێ : [ناو] ڕێ گومکێ؛ ایزگوم کردن؛ شوێنەگومکی؛ هەزارەدوولایی. (ردگم کردن)
ڕاگوێز : [ناوبک] ڕاگوێزەر؛ کەسێک کە ڕادەگوێزێ. (منتقل کننده)+
ڕاگەیێن : [ناو،بک] کەس یان ئامرازی بلاو کردنەوەی خەبەر؛ ڕادیۆ یان خەبەر وێژی ڕادیۆ. (گوینده و رسانه خبری)+
ڕالووای : [چاوگە،ت] بەڕێگادا ڕۆیشتن؛ ڕێگابڕین.(رامرفتن)
ڕا لێبوون : [چاوگە،ت] ڕا لەسەر بوون؛ پە سەندکردن. (برگزیدن؛ عقیده داشتن)
ڕامداندن : ڕاخستن؛ پان کردنەوە؛ داخستن. (پهن کردن)
ڕاموو : ڕامین؛ هێمن؛ ئارام؛ ڕام بوو؛ (آرام شده؛)
ڕامی : [ناو] (١) ناوی جۆرێک یارییە بە پەڕانتۆ. (رامی) ٢) دەستەمۆیی. (حالت رام بودن)
ڕانک‌وچۆغە : [ناو،ت]کەواو پانتۆڵی لە بووزوو؛ ڕانی‌وبەرگووز؛ شاڵ‌وشاپک. (فرنج شلوار از شال پشمی)

ڕانوێن : [ناو،بک] ڕانوما؛ ڕانیشاندەر؛ ڕێنموون. (راهنما)
ڕانەکی : [ناو] پاڵوو؛ پاڵدوو. (پاردم)
ڕانیار : [ناو،بک] ئاژووەر؛ هاژۆتەر؛ هاژوەر؛ لێخوڕ. (راننده)
ڕانیە : شاری ڕانیە لە ناوچەی بیتوێنە. (نام شهری است)
ڕاو : [ناو](١) ڕاڤ؛ شکار. (شکار)(٢)لکەی سەرو چاوی ژنی تۆڵدار. (لکه روی‌صورت زن آبستن) (٣) شیلەی هەنگوین. (شیره عسل)(ب٤) گاڵتەپێکردن. (دست‌انداختن) (٥) فەند و فێڵ.(حیله). (٦) دەستەمۆکردن؛ خستنە تۆڕ؛ ڕامکردن؛(ب)کوڕێک کە کچێک سازبکا. (رامکردن)
ڕاوارتن : [چاوگە،ت] گوێزانەوە؛ گوێزتنەوە. (جا بجا کردن)
ڕاوباز : [ئاوەڵناو](ب) درۆزن؛ گزیکار؛ کەلەکباز؛ فێڵباز؛ حۆقەباز؛ ئاگوڵباز. (حقەباز)
ڕاوبازی : [ناو] قەلودەل‌کاری؛ فریوکاری؛ حۆقەبازی؛ فێڵەبازی؛ داوبازی؛ حیلەبازی. (حقەبازی)
ڕاوکردن : [چاوگە،ت] نێچیرکردن؛ (ب) ڕازی‌کردن و ڕام کردنی‌کیژ. (بە تور انداختن و شکارکردن)
ڕاووک : [ناو] کیسەی ئاوی تری و هەنارگرتن. (کیسە آب انگورگیری)
ڕاووگ : >ڕاووک.
ڕاوەباڕ : [ناو،ت] دەستەواژەی ڕاوچیانە؛ ڕاوی‌ئاخری‌هاوین کە بێچووی کەو گە ورەدەبن. (شکارکبک‌درآخرتابستان)
ڕاوەست : [کاری ئەمری] ڕاوەستە؛ دەست

ڕاگره؛ بوێسته. (ایست)
ڕاوەکـەر : [ناوبـک] شـروڤەکـەر؛ (ب) دووخاڵ (:)کە نیشانەی (واتا) یان شـروڤە-کردنە لە نووسین دا.علامت( : )
ڕاویش : [ناو] لەڕووی نووسراوە نووسـینە-وە. (نسخه برداری)
ڕاهانین : [چاوگـە،ت] ڕاهێنـان؛ بارهێنـان؛ پەروەردە کردن. (پرواراندن)
ڕاهێڵە: (١)[کاری ئەمری] شۆڕی بکەرەوە. (آویزان‌کن) (٢) [ناو] تـەونـی داپیروشـک؛ داوەتەنە؛ ڕایەڵە؛ (تارعنکبوت)> ڕایەڵە.
ڕاهێنەر : [ناوبک] فێرکەر؛ پـەروەردەکـار؛ بارهێنەر؛ (پرور)
ڕایت : [ناو] وشەییێکی بیانییە واتا نووسـین (ب) چاپ‌کـردن بـە ئـامیری ڕایتێـر؛ لـە-کوردی‌دا ڕاویش و ڕایش و ڕایژ؛ بەواتای لەبـەر نووسـینەوە و وێنـە هـەڵگـرتن لـە نووسراوە هەیە و (زۆر نزیکە بە ڕایـش‌ی-کوردی.) (ڕایت)
ڕایژە : [ناو] ڕاوێژکار. (رایزن)
ڕایەخ : [ناو] ڕایخ؛ ڕاخەر؛ (ب)ئەوەی ڕادە-خرێت بۆ لەسەر دانیشتن. (زیرانداز)
ڕایەڵ : [ناو] ڕەهێل؛ خەواندنی هـەرشـتی ئەسـتوونی بـە حاڵـەتـی ئاسـۆیی و درێـژ ڕاکێشاندنی. (خوابانده ودراز شده)+
ڕایەڵ‌کردن :[چاوگە،ت] تەناف شۆڕکردنە-وە ؛ دارخستنە سەربانی خانوو؛ دارەڕا، خە-واندنی دەسەک لە دارە ڕادا؛ تەناف گێـڕان و داچنینـی تـەنـافی تـەون؛ داخسـتن؛ ڕاخسـتن؛ پـان‌کردنـەوە. (خوابانـدن ودرازکردن؛ پهن کردن تار قالیبافی)

ڕایەڵە :ڕاهێڵە؛ڕاییڵە؛یان( تـۆڕ)؛ بـە واتـای داوی جۆڵاتەنـە لـە جیـاتی تـەلچـن بـە-جێترە.(تور، شبکه)
ڕبەنار : [ناو] ڕبێ‌هەنار. (رب‌انار)
ڕچە : [ناو] جێ‌پێ. (ب) ڕێوشوێن؛ بوار؛ بە ڕچەی کەسێکدا ڕۆیشتن: بەئوڕناک کـردن. (جاپا)
ڕچەشۆت : [ناو] دۆندرمە؛ بەستەنـی؛ ئـەو ڕچـە لـە چاوگـەی (ڕچـان و ڕچـین )ەوە هاتووە.وشوت،لەتورکیدا: سوت، واتـا شـیر. (بستنی)
ڕچیاگ : [ناوبەر] ڕچاو؛ بـەسـەهـۆڵ‌بـوو. (یخ‌بسته)
ڕژاگ : [ناو] (١) بەردێکی نەرمـە و بـەردە مردو ویشی پێ‌دەڵێن.(٢) [ناوبەر] ڕژیـاگ؛ ڕژاو. (نوعی‌سنگ‌نرم؛ ریخته‌شده)
ڕژد : [ناو+ ئاوەڵناو] ئامووریێک‌کە گاسـنە-کەی زۆر لەعەرز بچەقێ؛ دژی ئـامووری-ماڵ؛ چکووس. (گاوآهنی که زیاد درزمـین فرو رود، خسیس)+
ڕست : [ناو] یەکەی شـماردنی تـەمـەنـی تاژی.(واحد شمارش‌سن‌تازی)+
ڕستاق :[ئاوەڵناو] بەرانبەر؛ بەرامبەر. (برابر)
ڕسـتی : (١)[ناوبـەر] ڕێسـراو؛ تشـتێکۆ هاتیەڕستن: شتێک‌کـە ڕێسـراوە؛ ڕێسـراو. (ریسـیدەشـدە). (٢) [نـاو] عـەرزی پتـەو. (زمین‌سخت)(٣) ئەو ڕسـتی؛ ڕابـووردووی ڕستن بۆ هەوەڵ‌کەسـی نادیـار. (ریسـیده؛ بافت؛ ریسید)
ڕسـوابوون : [چاوگـە،ت] ڕیسـوابوون؛ ئابڕووچوون. (رسواشدن)

ڕسەر : [ناو] مەڕی سەروملسپی. (گوسفند سروگردنسفید)
ڕسەربەڵەک :[ناو] مەڕی بەڵەک کە سەری سپیبێت. (گوسفندابلقسرسفید)
ڕشته : (۱) [ڕابوردووی ڕشتن] ڕێژراو؛ وەک چاورێژراو. (وسمەکشیده) (۲) تاڵی هۆنراوە بەموورو یان مرواری؛(۳) ڕندۆڵ؛ بزگوڕ.(رشته)+
ڕشفەت خواردن : [چاوگە،ت] بەرتیل وەرگرتن؛ بەرتیل خواردن. (رشفەخوردن)
ڕشقەن : [ناو] ڕشخەن؛ گاڵتە؛ بزەی سوعبەت پێکردن. (ریشخند)
ڕفانای : [چاوگە،ت] ڕفاندن؛ فراندن. (ربودن)
ڕقنیشتنەوە : [چاوگە،ت] ئەرناف لێچوون؛ ئارامبوونەوە؛ تەواو بوونی کەرب و ڕق. (زایلشدنعصبانیت)
ڕکانێ : [ناو] ملە؛ کێبەرکێ. (مسابقە)
ڕمای : [چاوگە] رمان؛ ڕووخان؛ تێک تەپین؛ ڕمان.(فرور یختن)
ڕمە : [ناو] سەهۆڵ؛ یەخ؛ زیاتر بۆ چلوورە سەهۆڵ بەکاردەبرێت. (دنگال)
ڕندک : [ناو] ڕندۆک؛ ڕۆنتک؛ ئەسر؛ ڕۆنک؛ ئەسرین؛ فرمێسک. (اشک)
ڕندۆڵ : [ناو] تیتۆڵ؛ شیتاڵ؛ بزگوڕ؛ تیسمالکیقوماش. (بزگور)
ڕنە : [ناو] حەیاز؛ حەیاس؛ چۆ؛ چق؛ ناخوونی دیاری دان و بەراوەردپێکردنی تەمەنی کەڵەشێر. (ناخنخنجر مانند پای خروس)
ڕوباب : [ناو] ئامێرێکی مۆسیقای تەلی، (سیمی) بووە لە قەدیمدا. (رباب)
ڕوبل : [ناو] یەکەی دراوی ڕووسیا. (واحدپولروسیه)
ڕۆبنار : [ناو] ڕبەنار؛ ڕبیهەنار؛ ڕیچاری هەنار. (ربانار)
ڕۆپیە : [ناو] یەکەی دراوی هێندوستان. (واحد پولهندوستان)
ڕۆجیارگیریای: [ناو،ت] ڕۆژ گیران. (روزگرفتگی؛ خسوف)
ڕۆجیارنیشتەی : [چاوگە،ت] ڕۆژئاوابوون. (آفتابغروب کردن)
ڕۆجیارهورئامای : ڕۆژ هەڵهاتن. (برآمدن آفتاب)
ڕۆچە : [ناو] ڕۆژوو؛ ڕۆژە؛ ڕۆژگ. (روزە)
ڕۆچی : [ناو] ڕۆژوو؛ ڕۆژگ. ڕۆژی؛ ڕۆچە؛ ڕۆچی.(روزە)
ڕۆح هاتنە سەرلێو: (ب) زۆر ترسان؛ نزیک بە مردن لە ترسان. (کنایی، خیلی ترسیدن)
ڕوخ : [ناو] (۱) ناویچارداش لە سیودوو داشی شەترەنج. (رخ). ۲) ڕوخسار؛ سەروچاو؛ ڕوو؛ سیما. (رخ)
ڕۆژنەڕۆژێ : [بەند] ڕۆژێ نا ڕۆژەکەیدی؛ (ب) دوو ڕۆژ جارێک. ڕۆژنا. (روزدرمیان)
ڕۆژوو شکاندن : [چاوگە،ت] کۆتایی هێنان بەڕۆژوو. (روزەشکستن)
ڕۆستەم : ناوەبۆ پیاوان؛ پاڵەوانی بە ناو بانگ. (رستم)
ڕۆمان : [ناو] نووسینی چیرۆکی درێژ. (رمان)
ڕۆشنا : ناسینی کەسێک بەڕواڵەت؛ بەڵام

ئەم وشە سەربەخۆنییە وحاڵەتی پاشبەندی هەیە بۆ(ئاشنا)، ئاشناوروشنا بەواتای ناسیاوگەلێکن کە بەڕواڵەت دەناسرێن و هێشتا نەبوونەتە دۆست و هاوال. (روشنا)
ڕۆشنایی. (روشنایی)
ڕۆناس : [ناو] ڕۆنیاس؛ گیای ڕەنگکردنی بەن. (روناس)
ڕۆن‌بەنگ: [ناو،ت] ڕۆنێک کە لە گوڵی شادانە دەگیرێت؛ ماکێکی هۆشبەری تێدایە. (روغن‌بنگ)
ڕۆن‌جەلا : [ناو،ت] بۆ بریقەدارکردنی وێنەی ڕەنگ و ڕەوغەن یان بریقە-دارکردنی دەرکە و هەرکەرەستەی چێوی بەکەڵکە. (روغن‌جلا)
ڕۆن‌سوتاندن: [چاوگە،ت] بەهۆی شل بوونی بازنەی ڕینگی سوپاپ لە مۆتۆڕی سەیارەدا ڕۆن تێکەڵی بێنزین‌دەبێت و مۆتۆڕ دووکەڵی زۆردەبێت و ڕۆن کەم دە-کات. (روغن‌سوزی)
ڕۆن‌کاری : [ناو، بەرهەمی چاوگە]چە-ورکردنی بەند و جومگەگەلی مۆتۆڕ بۆ ڕە-وان‌کارکردن. (روغن‌کاری)
ڕۆن‌ماسی : [ناو،ت] ڕۆنێک کە لەماسی دەگیردرێت. (روغن‌ماهی)
ڕۆنەر : [ناو،بک] دانەر. (گذارنده)
ڕۆنەڕو : <ڕۆژنەڕۆژێ.
ڕۆنێ : [کاری ئەمری بو دانان و دانیشتن] (١)دانێ.(بگذار). (٢) ڕۆنیشە؛ دانیشە. (بنشین)
ڕۆنی‌ئەلیف : [ناو،ت] لەوێنەکێشی‌دا یان بۆ گرتنەوەی ئەکلیل بەکاردێت. (روغن‌الیف)
ڕۆنی‌ئیسکاتیف : [ناو،ت] ڕۆنێکی گیاییە بۆ زووتر وشک بوونەوەی ڕەنگی وێنە-کێشی دەیکەنە نێو ڕەنگەوە. (روغن اسکاتیف)
ڕۆنی‌گیایی : [ناو،ت] ڕۆنێک کە لە تووی. (بەری‌گیا) وەک ناوکی پەموو و تووگوڵە-بەڕۆژە دەگیرێت. (روغن‌نباتی)
ڕۆنی‌مۆتۆڕ : [ناو،ت] بەرهەمێکی پاترۆڵی (نەوتی)ە بۆڕەوان‌کارکردنی مۆتۆڕ بەکە-ڵکە. (روغن‌موتور)
ڕووان : [ناو] پێوەلکان وجووت‌بوونی سپڵۆتی نێرلەمێو. (حالت‌جفتگری‌سگ)+
ڕووباری‌کرن : [چاوگە،ت] ڕووبارکردنەوە؛ بەرەو روو کردنەوە. (روبروکردن)
ڕووبەڕاکردن : [چاوگە،ت] وەری‌خستن؛ جێبەجێکردن. (روبراه‌کردن)
ڕووپۆش : [ناو] (١)نیقاب. (نقاب). (٢)عە-بائاساییێکە ژنان‌دەیکەنە بەر. (روپوش)
ڕووپۆشین : [چاوگە،ت] دەمو چاو شاردنە-وە بە دەستماڵ و لەچک یان هەر چی.(ب) شەرم کردن. (روگرفتن)
ڕووپۆشین : [چاوگە،ت] سەری دەفر داپۆشین؛ داپۆشین بە قوماش یان هە-رچی؛ڕوخسارداپۆشین. (سەرپوشیدن)
ڕووپێوی : [ناو،ت] پێوان و دیاری‌کردنی درێژی و پانی هەر ڕووپەر و تەختایییێک. (مساحی)
ڕووتنای : [چاوگە،ت] ڕووتەوەکردن؛ ڕووتکردنەوە. (لخت‌کردن)
ڕووتوش : [ناو]دەستەواژی وێنەگەریە واتا جوانکاریی لەسەر فیلمی وێنەگیراوی

سیما(پۆرتره). (رتوش)
ڕووتەختی : [ناو] جۆرەجاجم یان پەشمینە یان قوماشێکە دەدرێت بەسەر پێخەفی سەر قەرمویڵەی نووستندا. چەرچەف. (روتختی)
ڕووخلاکۆر : [ناو] ڕیخۆڵەکوێرە. (روده کور)
ڕوو خوروک : [ئاوەڵناو] دەمو چاو گرویّ؛ ڕوخسار هاولایی. (آبله‌رو)
ڕوودار : [ئاوەڵناو] بیّشەرم و پڕ ڕوو. پررو؛ بی‌شرم)
ڕووداو : [ناو]بەسەرهات؛ بەدیهاتوو یان قەو مانی کارێک؛ خولقانی بەسەرهاتێک. (رویداد)
ڕوودڵ : [ناو] گرفت. (رودل)
ڕووسکە: [ناو] گوڵەجاف؛گوڵە جە فاکێش؛ گوڵێکە لە ناوچەکانی سنە و سەقز و سلێمانیدا زۆر دەڕویّ و بۆ ئازارە باریکە بە-کەڵکە. (گل خیار؛گل کارگر)
ڕووشۆر : [ناو] دیمەشۆرە. (روشور)
ڕوونووس : [ناو] نووسینەوە لەبەر دەقێکە-وە؛ ڕایش کردن. (رونویس)
ڕوونەبوون : [چاوگە،ت] (ب)شەرم و حە-یاکردن. (شرم کردن)
ڕووهاتن : [چاوگە،ت] ڕووهەڵاتن؛ شەرم-نەکردن. (شرمنکردن)
ڕووەک : [ناو] داروگیاوگژیّ کە سەرلە-خاک دەر دێنن. (گیاهان)
ڕووەو : بەرەو؛ ڕووەو بازارچوو: ڕوو بەلای-بازارداچوو. (روبه)
ڕوویگ : [ڕابوردووی ڕۆیین] ڕۆیشتوو. (رفته)
ڕۆهێشتن: [چاوگە،ت] داهێشتن؛ داهێلان؛
شوڕکردنەوە. ((آویزان کردن)
ڕۆیشتنەجیّ : لەکۆڕی یاری پەڕانتۆدا وەک (ڕامی و ئاس)چوونە جیّ‌ونەدیتن(جارفتن)
ڕۆیی : ڕۆیشت؛ چوو.[ڕابوردووی ڕۆیشتن] (رفت)
ڕەبساندن : [چاوگە،ت] کۆمکردنەوە؛ کۆکردنەوە؛ کۆما کردن. (کپه کردن)
ڕەبسین : [چاوگە،]کۆمابوون؛ کۆم بوون. (کپه شدن)
ڕەبناوک : [ناو] سمڵ؛ گیاییێکی‌بۆن‌خۆشە. (گیاهی خوش‌بو)
ڕەبەنگ : [ناو] ڕێواسی‌کوڵەبنە؛ قالاّبن. (ریواس کوتاه قد)
ڕەبەنی : [ناوبەرهەمی‌چاوگە] بیّژن و منداڵی؛ تەنیایی؛ ماڵ‌بەکۆڵی؛(مجرد)
ڕەپاندن : [چاوگە] ڕەتاندن؛ چوارناڵ غار پێکردن؛ ماندووکردن؛ زۆرگێڕان. (خسته کردن)+
ڕەپ‌ڕەپ : [دەنگەناو،] تەپەتەپ؛ زرمەزرم. (صدای تاپ‌تاپ)
ڕەپ وراست : (١) [ئاوەڵناو] قیت وقنج ڕاوەستاو. (راست ایستاده) (٢)[بەند] بیّ-ڕووبینی ئاخافتن، دەپودۆغر. (رک و راست)
ڕەپ و هۆڕ : [دەنگە ناو،] تەپەتەپی توند و زۆر؛ زرم وهوڕ. (صدای تاپ‌تاپ زیادوبلند)
ڕەپەکە : [ناو](ب) شیناوەردی بیّهێز و لاواز. (گیاه و سبزه بی نمو و غیر شاداب)
ڕەپەڵگا : [ناو] ڕەپێڵگە؛ پاوانی بەرهەڵدا کراو؛ یاریگە و جێگای هاتن و چوون. (میدان بازی و رفت وآمد)+
ڕەپێنان : ڕاونان وهەڵبرین و وەدواکەوتن.

(درپی دویدن و بیرون کردن)
ڕەتلْ : [ناو](١)گون. (خایه)(٢) پێوەرێک بوو لە قەدیمدا. (پیمانەای قدیمی)
ڕەتوم : [ناو] مورشیدی دینی زەردەشتیان. (مرشد دینی زردوشتی)
ڕەچەڵەک براو : [ئاوەڵناو] دوابراو؛ (ب)بێ-کوڕ؛ وەجاخ کوێر. (اجاق کور)
ڕەحەتی : [ناو] ڕاحەتی؛ کراس وشەرواڵی ناو ما لْ وخەوتن. (بیژاما)+
ڕەخ وروْخ : >ڕاخ و ڕەخ.
ڕەختئاوێز : [ناو] چێولیباس.جێگای جلوبەرگ پێدا هەڵواسین. (رختآویز)
ڕەختخاوپێچ : [ناو]جاجم؛جاش؛ مەوج؛ جارجیم. (رختخواب پیچ)
ڕەدبوونەوە : [چاوگە،ت] ڕەتبوونەوە؛ وە-رنەگیران؛ قەبوول‌نەبوون لەئەزموونی - خوێندن‌دا. (ردشدن)
ڕەدکردن : [چاوگە،ت] ڕەتکردن؛ دەر بازکردن؛ بەڕێکردنی کەسێک کە لە مە-ترسیدابێت.(ردکردن)
ڕەدموکردن : [چاوگە،ت] دانەدوواوە؛ قبوولْ نەکردن؛ گەڕاندنەوە؛ وەرنەگرتن. (-ردکردن)
ڕەزاسووک : [ئاوەڵناو] ڕەزاشیرین؛ ئێسک سووک؛ لەبەردڵان؛ خوێن‌شیرین.(تودل‌برو)
ڕەزایەتدان : [چاوگە،ت] ئیجازەدان؛ ڕازی‌بوون؛ (ب) خۆش‌بوون لە تاوانبار لە-لایەن شکایەتکارەوە.(رضایت‌دادن)
ڕەزکنان : [چاوگە،ت] پێداکردن؛ پێراکردن؛ تیْڕۆکردن؛(ب) کاری سە رجێیی. (فروکردن)

ڕەزم : فد: [ناو] جەنگ؛ شەڕ. (رزم)
ڕەژەکی : [ناو] کویروو. (سیاهک گندم)
ڕەژیدەر : [ناو،بک]چێکەر؛ دروستکەر؛ ئافرێنەر؛ دروستکەرەوە. (آفریننده؛ تعمیرکننده)
ڕەساس : [ناو] قورقورشم. (سرب)
ڕەسەو : [ناو] جەز؛ جێز؛ ڕەفسە؛ مالووسکەی گەنمی سوور بووی خەرمان. (گندم‌پاک‌شده‌خرمن)+
ڕەشبام : (١) ڕەش‌بومایە؛ڕەش بووایێتم.(سیاه‌میبودم). (٢) مەیلەوڕەش؛ڕە-شباو؛ ڕەشتاڵە. (سیاه. تیره)
ڕەش‌بەشە : [ناو] گامارۆ؛ مریشکەڕەشە؛ فرندەیێکی(فرندەیەکی) مەلەوانە. (چنگر)
ڕەش‌دەرمان : [ناو] گیای سیاو پووژ؛سیاپۆش. (پرسیاوشان‌سیاه)
ڕەشکاچاف : [ناو] بیبیلەی‌چاو؛ ڕەشکێنەی چاو. (قرنیه‌چشم)
ڕەشکاکای : [ناو] ڕەشکەکا.(طورکاه کشی)
ڕەشکوێت : [ناو] ڕەنگی ئەسپی‌کە کوێتی تۆخ بێت و بەسەر ڕەشیدا بڕوانێت. (کمیت‌تیره)
ڕەشمێو : [ناو] ڕەشەمێو؛ مێوی تریْڕەشە. (مو انگورسیاه)
ڕەشۆکی : [ناو] (ب) بزنەگەل. (بزها) (ف. هن) تفەنگی ڕەشۆکی. (نوعی تفنگ سرپر)+
ڕەشەبی : [ناو] جۆرێک‌داربی. (نوعی‌بید)
ڕەشەتوو : [ناو] داری تووشیرینی ڕەنگ سووری‌تۆخ و بەرەکەی؛ گاتوو؛ شاتوو. (شاەتوت)

ڕەشەچاو : [ناو] گیای سیاچاو؛گیای-سیاداری کە بۆنەخۆشینی فێ بەکەڵکە. (خربق)
ڕەشە دار : [ناو] ڕەش دار؛سیاوچنار؛ ڕەشە-چنار. (صنوبرسیاه)
ڕەشەداڵ : [ناو] داڵەگوورگە؛ جۆرێک داڵە کەلاکی تۆپیو دەخوات. (دال سیاه)
ڕەشەڕاف : [ناو] ڕاوی ڕەشێنک؛ ڕاوی بێ-بەفر. (شکار دروقت نبودن برف)
ڕەشەقەزوان : [ناو] داری ڕەشەوەن؛ وەنە-سیاوی؛ بەر و گەڵاکەی دەهاڕنەوە بۆ بە-رگری لە وەڕینی قژ و بۆ چارەسەرکردنی کەچەڵییش بەکەڵکە. (بنه کوهی)
ڕەشەگزەر :[ناو] گیای گزەرگە سیاوی. (شقاقل)
ڕەشەوار : [ناو] دەواری لە موو چێکراو؛ سیامال؛ سیاچادر. (سیاه چادر)
ڕەشەوبوون : [چاوگە،ت] بەفری کێوان چوونەوە. ڕەش هەڵگەڕان؛ ڕەش بوونەوە؛ ڕەش بوون. (سیاەشدن)
ڕەعنا : (۱)ناوی ژنانە. (اسم زنانه).(۲) [ئاوە-ڵناو]خاوەن بەژن و بالای شەنگ؛ نەرم و نۆڵ؛ شل و مل.(زیبای نەرم اندام)
+ڕەفە : قاتەکانی گەنجە. (طبقات قفسه و گنجه)
ڕەقاشک : [ناو] ئامێری خەڕاتی. (دستگاه-خراتی)
ڕەقۆنەک : [ئاوەڵناو] گورگە؛ قاچاخ؛ هە-ڵاتووی خۆ وەشێر. (تحت تعقیب)
ڕەقین : [چاوگە] ڕەوکردن؛ بازدان؛ هە-ڵاتن؛ ڕۆیشتن. (فرار)
ڕەقاز : [ناو] (۱)گوێزی بە دارەوە وشکبوو. (گردوی روی درخت خشکیده). [ناو،بک] ڕەقاس؛ ڕەخس کەر. (رقاس)
ڕەقاندنەوە : [چاوگە،ت](۱) وەک :بە دیوارە وەچەسپاندن و بەنهێم گوشاردان. (بدیوار چسپاندن وفشاردادن) (۲) ناسک کردنە وەی دەمەداس بە چەکوش. (نازک کردن تیغه داس باچکش)
ڕەکسانا : ناوی کچی کوورش. (نام دختر کوروش)
ڕەگاژۆ : [ناو] ڕیشاژۆ؛ لەسەرریشە سە-وزبوون و پەرە سەندنی دار. (روی ریشه جوانەزدن سبزشدن)
ڕەگاوڕەگبوون : [چاوگە،ت] ڕەگبەڕەگ-بوون. (رگبرگ شدن)
ڕەگبڕە : [ناو] ملە؛ جۆبڕە؛ جۆبڕک. (آبدزدک)
ڕەگەزپەرس : >ڕەگەز پەرست.
ڕەگەزپەرست : [ناو] نژاد پەرەست.(نژاد پرست)
ڕەگەزناس : [ناو] نیژاد ناس. (نژاد شناس)
ڕەلم : [ناو] خیزی ورد؛ نەرمەخیز؛ ڕەمل. (ماسه)
+ ڕەمز : عد؛ فد: [ناو] (۱)چەندژمارە یان پیتی نەهێنی بۆ کردنەوەی قوفلی ڕەمزدار. (۲) ڕاز. (رمز)
ڕەمەکی : ئاکۆیی(ب) دوور لە شارسانییە-ت؛ گاڕەش؛ گاڕانی؛ ئاسایی. (بی توجه به ئاداب ؛ بی تمدن)
ڕەمەن : [ناو] وشکەچن؛ دیواری هەڵچنراو بە بەرد. (دیوار سنگی بی ملات)

+ڕەنجـدان: [چاوگـە،ت] ئـازاردان.(آزاردا دن)فـەهن. ڕەنج پێدان؛ (رنج دادن) ڕەنج-کێشان.(زحمت‌کشیدن)
ڕەنجدەر : دژواتایە.(١) [ناو،بک] ڕەنجێن؛ کەسێکە دەڕەنجێنی (رنجانـنـده). [ناو،بـەر] (٢)(ف.هن) ڕەنجبەر. (رنج‌کش)+
ڕەند : [ئاوەڵناو] ڕند؛ نەترس؛ ئازا؛ زیـرەک. (رند).(٢) جوان؛ قەنج (قشنگ)
+ ڕەنگ : [کۆڕی نیگارگەرییـە] هـەر ڕە-نگێـک جگـە لـە سـپی و ڕەش، کـە لـە نیگارکێشیشدا بە ڕەنگ لە قەڵەم نـادرێن ؛ هەموو ڕەنگێک لە تێکڵـاوکردنی سـێ ڕە-نگی سەرەکی(سوور، زەرد، شین )پێکـدێن. (رنگ)
ڕەنگاو : [ناو،بەر] ڕەنگ‌کراو؛ (ب)خەمڵیو و ڕازاوە بە رەنگ. (رنگ شده)
ڕەنگاوی : [ئاوەڵناو] رەنگ تیوەتلاو؛ ڕەنگ پیاساوراو. (رنگی‌شده)
ڕەنگ بەڕووەوە نەمان : ڕەنگ‌بزڕکان؛ ڕە-نگ‌پەڕین. (رنگ‌پریدن)
ڕەنگ‌کار : [ناو،بک] ڕەنگێن؛ ڕەنـگ‌کـەر؛ [ئاوەڵناو] کەسـێک کـە پیشـەی ڕەنـگ-کردنە. (رنگ‌کاری)
ڕەنگ‌گۆڕان : [چاوگە،ت] (ب) بەپێی بـارو دۆخی‌ژیان چوونە سەر ڕەوت و دۆخێکـی-تر. (رنگ‌عوض‌کردن)
ڕەنـگ‌گـۆڕان : [چاوگـە،ت] لـەشـەرمـان سوورهەڵگەڕان؛ یان لەترسان ڕەنگ هـە-ڵبڕوسقان. (رنگ‌برنگ‌شدن)
ڕەنگ‌هەڵ‌گەڕان : [چاوگە،ت] ڕەنگ بڕو-وسقان؛ ڕەنگ‌پەڕین؛ ڕەنگ‌شێوان. (رنگ-پریدن)
ڕەنگی : [ئاوەڵناو] ڕەنگین؛ هـەر ڕەنگـێ-جگە لە سپی و ڕەش، کە لە نیگارکێشیشدا بە ڕەنگ لە قەڵەم نادرێن. (رنگی)
ڕەنگی‌سارد : هەموو ڕەنگەکـانیتێکیڵـاوی نێوان زەرد و شین. (رنگ‌سرد)
ڕەنگی‌سەرەکی : تەواوی ڕەنگـەکـان لـە-تێکلاو کردنی جۆراوجۆری سێ‌ڕەنگی سە-رەکیی (سوور، زەرد، شـین) پێکـدێن؛ لـە-وێنـەگـەریـدا سـپی و ڕەش بـەڕەنـگ ناژمێردرێن، بەڵکو بە تاریک و ڕۆشـن دادە نرێن(رنگ‌اصلی)
ڕەنگی‌گەرم : دەسـتەواژەی نیگارکێشـییە: هەموو ڕەنگەکانیتێکـەڵـاوی نێـوان زەرد و سوور. (رنگ‌گرم)
ڕەنەکاری : [ناو، بەرهەمی‌چاوگە] تاشینی-دار بە ئامێری ڕەندە؛ ڕەنـدەکـاری. (رنـدە-کاری)
ڕەوازان : [ناو] بە شیاو لە قەڵەمدەر؛ ڕادای؛ بە ڕەوا دەزانێ؛ ویزا.< ڕەوانامە. (روادید)
ڕەوال : (ف. شە) ڕەوشت؛ شێوەی‌کار؛ ڕە-وتی‌کار. (روال)
ڕەوانامە : [ناو] ئیزنی چوون بۆ وڵاتێک کە لەلایەن نوێنەری ئەو وڵاتـەوە بـە بیانیـان دەدرێت؛ ویزا. (روادید؛ ویزا)
ڕەواندنەوە : [چاوگە،ت] ئاڵقەی زنجیر هە-راوکردنەوە؛ جەغز هەراو و گەورەکردنەوە؛ لەبەریەک‌ڕەواندنەوە؛ (گشادکردن)+
ڕەوانسـەر : شـارۆچکەیێکـە لـە بـەینـی کرمانشان و سنەدا. (نام‌شهرکی‌است)
ڕەوان‌کردن : [چاوگە،ت] چەورکردن و ڕۆ-

